56
پرۆژەی تیشک

عەبدولقادر عۆدە

# ئیسلام

## لەنێوان

## نەزانی عالمەکانی و بێ ئاگایی نەوەکانی !

وەرگێڕانی

جەمال حەبیبوڵڵا

پرۆژەی تیشك (٥٦)

پرۆژەی تیشك

# ئیسلام لە نێوان

# نەزانی عالمەكانی

# و

# بێ توانایی نەوەكانی

نووسینی : عبدالقادر عودە

وەرگێڕانی: جمال حبیبوڵلا

ناوی کتێب:  ئیسلام لە نێوان نەزانی عالمەکانی و بێ توانایی نەوەکانی

نووسینی:  عبدالقادر عودە

وەرگێڕانی:  جمال حبیبوللا

ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٧٣٥) ساڵی (٢٠٠٩)

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: سیف و سرمد

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشک)، ژمارە (٥٦)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:

www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە:

info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

الاسلام بين جهل علمائه وعجز ابنائه

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذى علم بالقلم، علم الانسان مالم يعلم، والصلاة والسلام على محمد النبي الامي الذي اختياره الله الهداية خلقه، فأرسله للناس كافة داعيا ومعلما: يدعوهم الى الله، ويعلّمهم كتابه، ويردد عليهم قوله جل شأنه: يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ قَدْ جَاءكُم مِّنَ اللّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ*يَهْدِي بِهِ اللّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلاَمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنِ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ(المائدة:١٥-١٦). پاشان، ئەوەی كە موسڵمان دڵتەنگ ئەكات ئەمەیە، ئەبینێ موسڵمانان لە لاوازییەكەوە بەرەو لاوازییەكی تر ئەچن، لە نەفامیی (جهل)ێكەوە دەرئەچن بەرەو نەفامییەكی تر، ناشزانن كە هۆی سەرەكیی ئەوەی تیایدا چەقیون نەشارەزاییانە بە شەریعەتی ئیسلام و جێبەجێ نەكردنیەتی بە تێروپڕی وەك خۆی، هەروەها نازانن كە خۆهەڵواسینیان بە یاسا دەستكردەكانەوە هۆی خراپیی و فەسادبوونیانە و لاوازیی بە دوای لاوازیی دێنێت بە سەریاندا و بۆیان بە جێئەهێڵێ.

بێگومان منیش باوەڕم وایە هەر لەبەر ئەوە وازمان لە ئەحكامی شەریعەتی ئیسلام هێناوە كە نایانزانین و زانایانیشمان لەم ڕووەوە پاڵیان لێداوەتەوە، یان دەستەوسان بوون لەوەی بیانناسێنن پێمان، خۆ ئەگەر هەموو موسڵمانێك ئەركی سەرشانی خۆی بەرامبەر ئەم شەریعەتە بزانیبایە، لە بەجێهێنانیدا كەمتەرخەمیی نە ئەكرد، بگرە لە خزمەتكردنی شەریعەتەكەدا پێشبڕكێمان دەكرد، هەر بەو جۆرەش لە جێبەجێكردنیدا.

منیش وامبەچاکزانی چاکترین شتێك که موسڵمان خزمەتی برای موسڵمانی خۆی پێبکات ئەمەیە، ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامی پێبناسێنێ، ئەوەی لای شاراوەیە دەریبخات بۆی.

ئەمەش نامیلکەیەکی بچووکه له ئەحکامەکانی ئیسلام، شتێکی وەهام تێدا کۆکردووەتەوه که موسڵمانی ڕۆشنبیر ناتوانێ دەستبەرداری ببێت، تیایا ڕووی ڕاستییم ڕۆشنکردۆتەوه لەبارەی هەندێ داواو لافی سەیرەوه کەوا هەندێ نەزان دەریان ئەبڕن لەسەر حسابی شەریعەتی ئیسلام، که نه پاڵپشتیان هەیه و نەژیربێژی (منطق) پەسەندیان ئەکات. هیوادارم ئەم نامیلکەیه بتوانێت ئەو وەزعانەی ئیسلام که به هەڵگەڕاوەیی له مێشك و بیری هەندێ برای زانادا هەن ـ بەڵام زانا به زانستی مەدەنی ـ ڕاست بکاتەوه، هەروەك ئومێدەوارم شتێکی وای تیابێت که پاڵ بنێت به زانایانی ئیسلامەوه و ڕێگای خۆیان بگۆڕن، له خزمەتکردنی ئیسلامدا شێوازێکی نوێ بگرنه بەر، له کاتێکدا ئەوان میراتگرانی پێغەمبەرانن و تەبلیغکەرانی پەیامی پێغەمبەرانن.

داوا ئەکەم له خوا هەموومان بخاته سەر ڕێی ڕاست.

جەمال حەبیبوڵڵا

بێدار

# بەشی یەکەم
# ئەوەی لەسەر موسڵمان پێویستە بیزانێت

ئێمە گرۆهی موسڵمانان شادمانین بەوەی سەر بە ئیسلامین، بەڵکو شانازیشی پێوە ئەکەین، بەڵام بەداخەوە گرنگترین ئەحکامی ئیسلامی نازانین و مەزنترین کۆڵەکە و پایەکانی پشتگوێ ئەخەین!

## ئەحکام و پایەکانی ئیسلام

حوکمەکانی ئیسلام ئەو بنەماو تیۆر (مباديء و نظريات)انەن کە قورئانی پیرۆز هێناونی و پێغەمبەر ﷺ گەیاندونی بە ئێمە، تێکڕای ئەو بنەما و تیۆرانەیە کە پێیان دەڵێین شەریعەتی ئیسلام. کەواتە شەریعەتی ئیسلام بریتیە لەتێکڕای ئەو بنەماو تیورانە کەئیسلام دایناون لە: یەکتاناسی (التوحيد) و ئیمان و عیبادات و ئەحوالی شەخسیی و تاوانەکان (الجرائم) و موعامەلات و بەڕێوەبردن (الادارە) و رامیاریی و... هتدی لە مەبەست و رێڕەو (الاتجاهات)دا.

مەزنترین پایەی ئیسلامیش بریتییە لەوەی حوکم بکرێت بە ئەحکامەکانی، چونکە ئیسلام هەر بۆ ئەوە هاتووە حوکمەکانی بزانرێن، شەریعەت و شەعائرەکانی بەرز بکرێنەوە و جێبەجێ بکرێن، بەم پێیەش هەرکەس کارکردن بە شەریعەتی ئیسلام بخاتە لاوە، یا لە کارکردن پەکیانبخات، بێگومان ئەوە ئیسلامی خستووەتە ئەولاوە و لە کارکردنی خستووە.

## ئەحکامەکانی ئیسلام بۆ دین و دنیا دانراون :

ئەو حوکمانەی کە ئیسلام هێناونی، دوو جۆرن: جۆرێکیان کاریان ڕاگیرکردنی ئایینە، ئەمانە ئەحکامی عەقائید و عیبادات ئەگرنەوە. جۆری دووەمیان کاریان ڕێکخستنی دەوڵەت و کۆمەڵگەیە، ئەمانە ئەحکامی موعامەلات، عقوبات، ئەحوالی شەخسیی، دەستووریی، دەوڵەتی و... هتد ئەگرێتەوە. ئیسلام دین و دنیا تێکەڵ بە یەك ئەکات، مزگەوت و دەوڵەت، واتە ئیسلام هەروەك مزگەتە، دەوڵەتیشە. وەك خواپەرستییە، سەرکردایەتیشە، هەروەك ئایین پارچەیەکی ئیسلامە، حکومەتکردنیش پارچەی دووەمیەتی، بگرە گرنگترین پارچەیەتی، بەڵێ (عوسمانی کوری عەفان) ڕەزای خوای لێبێ ڕاستی فەرمووە کاتێ گوتوویەتی: "ان الله لیزع بالسلطان ما لا یزع بالقرآن".

ئەحکامەکانی ئیسلام بە هەموو جۆر و ژمارەکانیانەوە بە مەبەستی بەختەوەرکردنی مرۆڤ هاتوون چ لە دنیادا و چ لە ئاخیرەتدا، هەروەها هەموو کارێکی دنیایی دیوێکی ئاخرەوی هەیە، کارێکی پەرستن، یان مەدەنیی، یان تاوانکاریی، یان دەستووریی، یاخود دەوڵەتیی لە دنیادا کاریگەریی چاوەڕوانکراوی خۆی هەیە کە بەجێهێنانی ئەرکە، یان بریتییە لە بەرپاکردن و پێکهێنانی حەڵاڵیەتی و موڵکایەتیی، یا بنج بەستکردن، یا ریشەکەنکردنی حەقێك، یا هێنانە گۆڕی سزایەك، یاخۆ ئەنجادانی بەرپرسیارییەك، هەریەك لەوانە و هیتریش کە خاوەنی شوێنەواری چاوەڕێکراوی خۆیەتی لە دنیادا، هەر بەو جۆرەش خاوەنی شوێنەواری چاوەڕێکراوی خۆیەتی لە ئاخیرەتیشدا کە بریتییە لە پاداشت وەرگرتن، یان سزا چەشتنی ئاخیرەت.

جا بینا لەسەر ئەوەی مەبەست لە شەریعەتی ئیسلام بەختەوەرکردنی مەردومە لە دنیاو ئاخیرەتدا، پێویستە بە یەك یەکە (وحدة) تەماشای ئیسلام بکرێت، یەکەیەکی وەها کە بەشبەشکردن ناگرێتە خۆی و پەسەندی ناکات، بە واتایەکی تر بەدەنێکە و پارچە پارچەکردن ناگرێتە خۆ، چونکە وەرگرتنی هەندێکی بەبێ ئەویتری، ئەو مەبەستە نادات بە دەستەوە کە لە پێناویدا هاتووە.

هەر کەسێك بڕوات بە شوێن ئایەتەکانی ئەحکامدا لە قورئاندا، ئەبینێ هەر حوکمێك لەو حوکمانە بە نیسبەت ئەوانەوەی سەرپێچی ئەکەن لێی، دوو سزا بە ئاشکرا بەدی ئەکرێت: سزایەکی دنیایی و سزایەکی ئاخرەویی. بۆ نموونە: ڕێ بڕی (ڕێگا لە خەڵك گرتن) سزاکەی کوشتنە و بڕینە، چوارمێخە کێشانە، دوورخستنەوە (نفي)یە، ئەمە سزا دنیاییەکە، سزاو ئازارێکی گەورەش لە قیامەتدا. ئەمەتا خوا ئەفەرموێ: (إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ) (المائدة: ٣٣). هەروەها بڵاوکردنەوەی داوێن پیسی، بوهتان کردن بۆ ئافرەتە پاکەکان، هەریەك لەمانە سزای دنیایی و سزای قیامەتیی هەیە. خوا ئەفەرموێ: (إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ) (النور: ١٩ ). (إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ * يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ * يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ) (النور: ٢٣ـ ٢٥). کوشتنی دەستەنقەستیش دوو سزای هەیە: تۆڵە لێسەندن لە دنیادا و سزادان لە ئاحیرەتدا. خوای گەورە ئەفەرموێ:

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى) (البقرة: ١٧٨). هەروەها ئەفەرموێ: (وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِناً مُّتَعَمِّداً فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا) (النساء: ٩٣)

هەر بەو جۆرەش خەریکە حوکمێکمان بەرچاو نەکەوێت کە شەریعەتی ئیسلام سزایەکی ئاخرەوی بۆ دیاریی نەکردبێت لە پاڵ سزا دنیاییەکەیدا، خۆ ئەگەر شتێکمان لەوبارەوە بەرچاو کەوت، ئەوا ئەچێتە ژێر تێکڕای ئەم فەرمودانەی خوارەوە: (أَفَمَن كَانَ مُؤْمِناً كَمَن كَانَ فَاسِقاً لَّا يَسْتَوُونَ * أَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ جَنَّاتُ الْمَأْوَى نُزُلاً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ * وَأَمَّا الَّذِينَ فَسَقُوا فَمَأْوَاهُمُ النَّارُ كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا أُعِيدُوا فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا عَذَابَ النَّارِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ). (السجدة: ١٨ـ٢٠). دیسان ئەفەرمێ: (وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ * وَمَن يَعْصِ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَاراً خَالِداً فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ) (النساء: ١٣ـ ١٤).

ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام بە هەوانتە (عبثا) دانەنراون بۆ دنیاو ئاخیرەت، بەڵکو مەنتیقە شەریعەتەکە خۆی وائەخوازێت، ئەم شەریعەتە لە بنەڕەتەکەیدا دنیا بەشوێنی تاقیکردنەوە و تیاچوون ئەژمێرێت، ئاخیرەتیش بە شوێنی مانەوە و پاداشتدانەوە دائەنێ، مرۆڤیش بەرپرسیارە لە کارەکانی خۆی کە لە دنیادا کردوویەتی و لە ئاخیرەتدا پاداشتی وەرئەگرێتەوە، ئەگەر چاکەی کرد ئەوا چاکە دێتەوە رێی، ئەگەر خراپەشی کرد دیارە یەخەی خۆی ئەگرێت، سزای دنیایش سزای قیامەت لە کۆڵ ناخات و نایشواتەوە، سا مەگەر مرۆڤ تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا.

شه‌ریعه‌تی ئیسلام له‌ یاسا ده‌سكرده‌كان جیاده‌كرێته‌وه‌ به‌وه‌ی دین و دنیا تێكه‌ڵ ئه‌كات ـ واته‌ هیچ كامیان فه‌رامۆش ناكات ـ، به‌ڵكو بۆ دنیاو ئاخیره‌ت دانراوه‌، ئه‌مه‌ش ته‌نیا هۆیه‌كه‌ كه‌ موسڵمانان ناچار ئه‌كات ملكه‌چیی شه‌ریعه‌ته‌كه‌ به‌ ئاشكرا و نهێنی، له‌ خۆشی و ناخۆشییدا بكه‌ن، چونكه‌ باوه‌ڕیان هه‌یه‌ ـ به‌پێی ده‌قی ئه‌حكامی شه‌ریعه‌ته‌كه‌ـ به‌وه‌ كه‌ ملكه‌چییكردن جۆرێكه‌ له‌و په‌رستنه‌ی نزیكیان ئه‌كاته‌وه‌ له‌ خواو له‌سه‌ر ئه‌و ملكه‌چییكردنه‌ پاداشتیان ده‌ست ئه‌كه‌وت، ئیتر ئه‌گه‌ر یه‌كێكیان بۆی رێكه‌وێت بتوانێ تاوانێك بكات و بشزانێ له‌ سزای دنیایی قوتار ئه‌بێت، هه‌ر نایكات، چونكه‌ له‌ سزای قیامه‌ت و توڕه‌یی خوا ئه‌ترسێ و خۆی ئه‌پارێزێ، ئه‌م هۆیه‌ش ئه‌بێته‌ هۆی كه‌مبوونه‌وه‌ی تاوان و پاراستنی ئاسایش و پارێزگاریكردنی رژێمی كۆمه‌ڵ، به‌ پێچه‌وانه‌ی حاڵه‌تی یاسا ده‌ستكرده‌كان كه‌ له‌ دڵ و ده‌روونی ئه‌وانه‌دا ئه‌مانیان به‌سه‌ردا جێبه‌جێ ئه‌كرێ، هیچ كاریگه‌رییه‌ك نییه‌ بتوانێت ناچاریان بكات بۆ ملكه‌چی كردنیان، ئه‌وسا هه‌ركه‌سێك هه‌ر تاوانێكی بۆ رێكه‌وت و زانی یاسا پێی نازانێ ـ كه‌ ناشزانێ ـ ده‌ی چیتر له‌ نه‌كردنی ئه‌و تاوانه‌ ئه‌یگێرێته‌وه‌ كه‌ ئایین و ڕه‌وشت له‌ ئارادا نه‌بن؟، به‌ هۆی ئه‌مه‌شه‌وه‌یه‌ له‌و وڵاتانه‌دا كه‌ یاسا ده‌ستكرده‌كان جێبه‌جێ ئه‌كرێ تیایاندا تاوان و تاوانكاریی رۆژ له‌ دوای ڕۆژ له‌ په‌ره‌سه‌ندندایه‌ و ره‌وشت جوانی له‌ لاواز بوونایه‌ و تاوانباران له‌ چینی به‌ناو رۆشنبیراندا روو له‌ زیاد بوونن به‌ پێی به‌دبوونی ره‌وشتی ئه‌و چینانه‌و توانایان له‌ خۆ ده‌رباز كردن له‌ ده‌سه‌ڵاتی یاسا.

## حوکمەکانی شەریعەت بەش بەش نابن

حوکمەکانی شەریعەت بەش بەش نابن و لە یەکتر جیاناکرێنەوە، ئەمەش نەك هەر لەبەرئەوەی کە باس و یاداشتمان کرد و گوتمان بەشبەشکردن پێچەوانەی مەبەستی شەریعەتەکەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە دەقەکانی شەریعەتەکە هەر خودی خۆیان رێمان لێئەگرن لەوەی پەیڕەوی هەندێکیان بکەین و هەندەکەی تریان بخەینە لاوە، هەروەك رێیان لێگرتین کە باوەڕمان بە هەندێکی تریان نەبێت.

هەروەها شەریعەتەکە هەروەك داوامان لێئەکات کە باوەڕمان هەبێت بە هەمووی، هەر بەو جۆرەش لەسەرمان فەرز ئەکات کە پەیڕەوی و کارکەر بین بە هەموو ئەحکامەکانی، جا هەر کەسێك وانەکات و وانەبێت ـ واتە باوەڕ و کرداری وانەبن ـ ئەوا بەر ئەم فەرموودەیەی خوا ئەکەوێت: (أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاء مَن يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنكُمْ إِلاَّ خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ) (البقرة: ٨٥).

ئەو دەقانەی کە لە بارەی حەرامکردنی کارکردن بەهەندێك لە شەریعەت و پشتگوێخستنی هەندێکی تری هاتوون زۆرن، لەوانە: (إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَـئِكَ يَلعَنُهُمُ اللّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ * إِلاَّ الَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَبَيَّنُواْ فَأُوْلَـئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ) (البقرة: ١٥٩ـ ١٦٠). لێرەدا شاردنەوە مانای کارکردنە بە هەندێك لە ئەحکام بەبێ هەندەکەی تر، یا ددانننانە بە هەندێکدا لەگەڵ ئینکارکردنی هەندێکی تردا.

هەم دیسان خوا ئەفەرمویٚ: (إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ الْكِتَابِ وَيَشْتَرُونَ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً أُولَـئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَّ النَّارَ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ * أُولَـئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُاْ الضَّلاَلَةَ بِالْهُدَى وَالْعَذَابَ بِالْمَغْفِرَةِ فَمَا أَصْبَرَهُمْ عَلَى النَّارِ). (البقرة: ١٧٤ـ ١٧٥). دیسان ئەفەرمیٚ:(فَلاَ تَخْشَوُاْ النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: ٤٤). (إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيْنَ اللّهِ وَرُسُلِهِ وَيقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً * أُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقّاً) (النساء: ١٥٠ـ ١٥١ ). (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَـكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى الله مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ * وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ * أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ) (المائدة: ٤٨ـ ٥٠).

## شەریعەتی ئیسلام شەریعەتێکی خوایی و گشتییە

شەریعەتی ئیسلام بەوە ناسراوە و جیا ئەکرێتەوە کە شەریعەتی گشتیی و گێتیە، خوای میهرەبان نازڵی کردووەتە سەر پێغەمبەرەکەی (موحەممەد) ﷺ هەتا ئەویش بیگەیەنێت بەسەر پاکی مەردم لە عەرەب و عەجەم، خۆرهەڵاتیی و خۆرئاوایی، بە سروشتە جیاوازەکانیانەوە، بە داب و نەریت و مێژووە

جیاجیاکانیانەوە، ئەم شەریعەتە شەریعەتی هەموو خێزانێکە، هی هەموو هۆزێکە، هی هەموو کۆمەڵ و دەوڵەتێکە، بەڵکو شەریعەتێکی عالەمیە و هەر ئەوە ئەو شەریعەتەی کە زانایانی یاسا هاتبێت بە بیرو خەیاڵیاندا، بەڵام هێشتا نەیاندۆزیوەتەوە و ڕێیان نەکەوتووە لێی. دەی ئەم فەرموودەیەی خوا بخوێنەرەوە: (قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً) (الأعراف: ١٥٨) هەروەها: (هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ) (التوبة : ٣٣ )

## شەریعەتی ئیسلام شەریعەتێکی تەواو هەمیشەییە

ئەم شەریعەتە کە لەلایەن خواوە نێرراوەتە خوارەوە بە تەواویی و هەمەلایەنیی (شامل)ی نێردراوە، هاتنە خوارەوەشی لە ماوەیەکی کورتدا بووە، بە سەرەتای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکرد و بە وەفاتی ئەو کۆتایی هات: یاخۆ لەو ڕۆژەوە کۆتایی هات کە ئەم فەرموودەیەی خوای تێدا هاتە خوارێ: الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً) (المائدة: ٣).

ئەم دەقە مەسەلەی کەماڵ و بەردەوامیی و هەمیشەییەتی شەریعەتەکە ئەبڕێتەوە، دیارە ئەمەش لە دوای بڕینەوەی ئەو مەسەلەیە کە (موحەممەد) ﷺ کۆتایی هێنەرە بە پێغەمبەران و ڕەوانەکراوان ـ دیارە ـ ئەمەش هەر بە دەقی قورئانی: (مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ) (الأحزاب:٤٠).

ئەو کەسەی کە بە ئەحکامی شەریعەتەکەدا ئەچێتەوە، ئەبینێ بە تێروتەواویی هاتووە، کەموکوڕیی تێدا نییە، هەموو کاروبارێکی ئەفرادان و کۆمەڵان و دەوڵەتان ئەگرێتەوە، چونکە ئەحوالی شەخسیی ڕێکوپێك ئەکات و موعامەلات و هەرچی پەیوەندیی بە تاکەوە هەیە ڕێك و ساز ئەکات، ئیشوکاری حوکم و ئیدارە و رامیاریی و هەرچی تریش کە پەیوەندیی هەیە بە کۆمەڵەوە ڕێکئەخات، سەبارەت بە پەیوەندیی دەوڵەتانیش لەگەڵ یەکترا، چ لە جەنگ و چ لە ئاشتییدا، هەر بەو جۆرەیە.

شەریعەتی ئیسلام بۆ کاتێك، یا چەرخ و سەدەیەك نەهاتووە، بەڵکو بۆ هەموو کات و چەرخ و سەدە و زەمانێك هاتووە، ئەبێ تا سەرزەوی ئاوەدانی لەسەر بمێنێ ئەویش هەر بمێنێتەوە و پەیڕەویی و ملکەچیی بکرێت.

بێگومان دەقەکانی شەریعەتەکە وەها داڕێژراون کە گۆڕانی ڕۆژگار کاریان تێنەکات و تازەیی، پیری بەخۆیەوە نەبینێ و بنەما و دەستوورە گشتییەکانی پێویستیان بە گۆڕین نەبێت، تیۆرە بنەڕەتیەکانیشی هەر بەو شێوەیەن. دەقەکانی ئەوەندە گشتیو پڕ لەنەرمونیانین ئەتوانێت حوکمی هەموو حاڵەتێکی نوێ بکات گەرچی پێشبینیکردنی ئەو حاڵەتەش لە توانادا نەبێت، بە هۆی ئەمەشەوە دەقەکانی ئەم شەریعەتە شایستەیی و دەستکاریی و گۆڕان نین، وەك یاسا دەستکردەکان کە هەمیشە لەگۆڕین و دەستکارییکردنان.

## بەراوردێك لە نێوان
## پەیدابوونی شەریعەت و پەیدابوونی یاسادا

بەڵێ، لەمەوبەر زانیمان شەریعەتی ئیسلام چۆن پەیدا بووە، بەڵام یاسای دەستکرد لەو کۆمەڵەوە پەیدا ئەبێت کە دایئەنێت و حوکمی پێئەکات، لە سەرەتاوە لاوازە، پایەکانی سنووردارن، پاشان بەپێی پێشکەوتنی ئەو کۆمەڵە، بەرەو پێشتر ئەبرێت و پایەکانی زیاد ئەبن و پێویستیەکانی ئەو کۆمەڵە چەند زیاد و جۆربەجۆر بن، ئەویش ئەوەندە پەرەئەدرێت بە تیۆرەکانی، هەروەها ئەو کۆمەڵە چەندێ لە بیرکردنەوە و زانستییدا پێش بکەوێ، ئەو یاسایەش ئەوەندە پێشکەوتوو ئەبێت.

هەروەها ئەوانەی کە بەسەر ئەو کۆمەڵەدا زاڵ و بە دەسەڵاتن، هەر ئەوانەن کە هەڵئەسن بە دانان و پاککردنەوە و ئاڵوگۆڕکردنی ئەو یاسایانە. کەواتە لێرەدا بەدیهێنەرە یاساکان کۆمەڵەکەیە و ئەویش بەو شێوەیە یاساکان دائەڕێژێ کە پێویستییەکانی خۆی دابین بکات، دیارە یاسا شوێنکەوتووی کۆمەڵەکەیە و پێشکەوتنی بەستراوە بە پێشکەوتنی کۆمەڵەکەوە.

یاسا ـ وەك زانایانی یاسا دەڵێن ـ دروستبوونی هاوکاتە لەگەڵ دروستبوونی خێزاندا لە چەرخەکانی یەکەمدا، ئەمجا بە پێشکەوتن و دەرکەوتنی هۆز، ئەویش پێشکەوت، ئەمجا بە پێکهاتنی دەوڵەت بەرەو پێشتر چوو، لە دواییدا قۆناغی دوایی پێشکەوتن لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا دەستی پێکرد لەسەر رۆشنایی تیۆرە فەلسەفیی و کۆمەڵایەتییەکان، ئیتر لەو کاتەوە تاکو ئێستا یاسای دەستکرد پێشکەوتنی گەورە و فراوانی بەخۆیەوە دی، تاوای

لێهات خۆی لەسەر تیۆرو بنەما راگیر کرد کە لە چەرخەکانی پێشوودا ئەمانە بوونیان نەبوو.

## سروشتی شەریعەت لە سروشتی یاسا جیاوازە

لەدوای ئەوەی پەیدابوونی شەریعەت و پەیدابوونی یاسامان خستە بەرچاو، ئێستا بە دڵنیایی و راستییەوە ئەتوانین بڵێین: شەریعەت وەك یاسا نییە.. سروشتی شەریعەت زۆر جیاوازە لە هی یاسا، خۆ ئەگەر سروشتی شەریعەت وەك هی یاسا بوایە، ئیتر شەریعەت بەو شێوەیەی کە هاتووە و بەپێی ئەو باسای کە کردمان نە ئەهات و نە ئەبوو، ئەوساش پێویست بوو شەریعەتێکی سەرەتایی بێت، ئەمجا لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵدا، وەك یاسا رێگەی پێشکەوتنی بگرتایەتە بەر، دەی بە هۆی ئەمەشەوە نەیئەتوانی ئەو تیۆرە تازانەی تیابێت کەوا یاساکان ئێستا خەریکن پەییان پێببەن، بەڵکو نەیئەتوانی بگاتە ئەو جۆرە یاسایانە، سا مەگەر لە دوای تێپەڕبوونی هەزارانساڵ، ئەویش پاش دەرکەوتنی یاساکان.

## جیاوازییە بنەڕەتییەکانی نێوان شەریعەت و یاساکان

شەریعەتی ئیسلام لە سێ رووەوە جیاوازییەکی گەورە و مەزنی هەیە لە یاساکان:

**رووی یەکەم:** شەریعەت هی خوایە و لە لایەن خواوە داڕێژراوە، بەڵام یاسا دەستکردی مرۆڤە، دەی هەریەك لە شەریعەت و یاسا بە ئاشکرا سیفاتی بەدیهێنەرەکەی خۆی تیایا رەنگ ئەداتەوە. یاسا دەستکردی مرۆڤە، بێگومان

ناتەواویی و دەستەوسانیی و لاوازیی و نەزانیی مرۆڤ تیایا رەنگ ئەداتەوە، بە دوای ئەوەشدا یاسا لەبەر دەستی گۆڕانکاریدایە، یاخۆ لەبەر دەست ئەوەدایە کە پێی ئەڵێن پێشکەوتن، ئیتر ئەو کۆمەڵە بەرەو هەر پێشکەوتنێکی پێشبینی نەکراو بڕوات، چەندەها حاڵاتی پێشبینی نەکراو ئەهێنێتە کایەوە. کەواتە یاسا هەمیشە ناتەواوە و هەرگیز ناتوانێت پێ بنێتە پلەی تەواوەتی (کمال)، چونکە بەدیهێنەرەکەی شایستەی ئەوە نییە بە تەواو (کمال) ناو ببرێت و هەرگیز ناشتوانێ بزانێ چی ئەبێت و چۆن ئەبێت، ئەگەرچی ئەزانێ چی بووە و چی روویداوە.

بەڵام شەریعەت بەدیهێنەرەکەی خوایە، دیارە هێزو توانای خالقیەتی، کەماڵ و مەزنایەتیی و چڵەپۆپەی ئاگالێبونی خوا بەوەی بووە و هەیە لە شەریعەتەکەدا خۆی ئەنوێنێ، جا لەبەرئەوەی داڕێژەرەکەی خوایە، دەی ئەبێ زانا و ئاگادار بێت بە هەموو شتێکی ئێستا و داهاتوو.

**رووی دووەم**: یاسا بریتییە لە چەندەها دەستووری کاتیی، کۆمەڵێك کەس دایان ئەنێن بۆ رێکخستنی کاروبار و دابینکردنی پێویستیەکانی خۆیان. کەواتە چەند دەستوورێکە شوێن کۆمەڵەکە دەکەوێت، یاخود لە ئاستی ئەمڕۆی کۆمەڵەکەدایە و سبەینێش لەو کۆمەڵە دوا ئەکەوێ، چونکە یاسا ناتوانێت بەو خێراییە بەرەوپێشەوە بڕوات کە کۆمەڵەکە ئەڕوات، هەروەها یاسا چەند دەستوورێکی کاتییە و لەگەڵ ژیانی کاتی کۆمەڵدا ئەگونجێنرێت، تا گوزەرانی کۆمەڵ لە گۆڕاندا بێت، ئەویش پێویستی بە گۆڕین و دەستکاریی کردن ئەبێت.

بەڵام شەریعەت ئەو دەستوورانەن کە خوای گەورە دایناون و توانای بەردەوامییان تێدایە بۆ رێکوپێککردنی ژیانی کۆمەڵ، شەریعەت و یاسا

هەردوکیان لەو رووەوە کە رێکخستنی ژیانی کۆمەڵە رێك ئەکەون، بەڵام شەریعەت لە یاسا جیاوازە لەوەدا کە دەستوورەکانی هەمیشەیین و گۆڕین و گۆڕانکارییان ناوێت، ئەم تایبەتمەندیی (المیزە)یە کە شەریعەت نیشانی ئەدات لە رووی "منطق"ەوە ئەمانەی پێویستە:

**یەکەم:** ئەبێت دەستوور و دەقەکانی شەریعەت ئەوەندە نەرمونیانیی و گشتییەت (العمومیە)یان تێدا بێت کە هەموو پێداویستییەکانی کۆمەڵ بگرن بە درێژایی هەموو رۆژگاران و بە قەدەر بەرەوپێشەوەچوون و زۆر بوون و جۆر بەجۆر بوونی پێداویستییەکانی کۆمەڵ و کۆمەڵگە.

**دووەم:** ئەبێت دەستوور و دەقەکانی شەریعەت ئەوەندە بەرز و شکۆمەند بن بە شێوەیەك کە مەحاڵ بێت لەکاتێکدا یا لە سەدە و چەرخێکا لە ئاستی کۆمەڵ دوا بکەون.

لە واقیعدا ئەوەی کە مەنتیق ئەیخوازێ بە هەردوو رووەکەیەوە، لە شەریعەتدا هەیە، بگرە ئەوە گەورەترین تایبەتمەندییە کە شەریعەت لە یاسا جیا ئەکاتەوە، دەقەکانی شەریعەت بە شێوەی گشت لایەنیی و نەرمونیانیی هاتوون و گەیشتوونەتە چڵەپۆپەی ئەم مەبەستە، لە بەرزیی و شکۆمەندیشا لەو ئاستەدان کە ئاست لەوە بەرزتر بە هیچ بیرو هۆشێکدا نایەت.

بێگومان زیاتر لە سیازدە سەدە بەسەر هاتنی ئەم شەریعەتەدا تێپەریوە، لەم ماوەیەدا زیاتر لە جارێك بارودۆخ گۆڕاوە و بیرورا و زانیاری ئێجگار پێشکەوتوون، پیشەسازیی و داهێنانی وەها هاتوونەتە گۆڕێ کە بە خەیاڵی مرۆڤدا نەئەهاتن، دەستوورو دەقەکانی یاسا دەستکردەکان لە جارێك زیاتر گۆڕانیان بە خۆیانەوە دی تا بتوانن خۆیان لەگەڵ گوزەران و بارودۆخی نوێدا

بگونجێنن، بە جۆرێکی وەها کە پەیوەندیی بپچڕێت لە نێوان دەستوورەکانی ئەو یاسا دەستکردەدا کە ئەمڕۆ پەیڕەی ئەکرێ و ئەوەی کە لە کاتی هاتنی ئەم شەریعەتەدا پەیڕەوی و جێبەجێکرا. بەسەر ئا ئەو هەمووەدا، بەسەر ئەوەشدا کە شەریعەتی ئیسلام گۆڕین و گۆرانکاری پەسەند ناکات، بنەماکانی و دەقەکانی هەر بە بەرزتر لە ئاستی کۆمەڵ ماونەتەوە و بە پێزترین دەستوور و دەقن لە رێکخستنو جێبەجێکردنی پێداویستیەکانی کۆمەڵدا، هەروەها نزیکترین شتن لە سروشتیەوە و بەهێزترین پارێزگاریکەری ئاسایش و ئارامیین بۆی.

ئەمەش یەك گەواهیی قەشەنگی مێژووە کە مێژوو لە پاڵ ئەم شەریعەتەدا ئەوەستێ بۆ دان و دەربڕینی ئەو گەواهییە قەشەنگە، گەواهییش لەوە قەشەنگتر مەگەر هەر گەواهیی و مەنتقی دەقەکانی خۆی بێت. گوێ بگرن لەم فەرموودەی خوا: (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) (آل عمران: ١٥٩) دیسان (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ) (الشورى: ٣٨). وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ) (المائدة: ٢) و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: "لا ضرر ولا ضرار فی الاسلام".

ئەوانە - بۆ نموونە- چەند دەقێکی قورئان و سوننە بوون کە لە رووی هەمەلایەنیی و گشتێتیەوە، لە نەرمونیانیدا گەیشتوونەتە دوورترین سنوور و بڕیاری (شوری) ئەدەن کەوا شوراش بنکەیە بۆ حوکم، بەو شێوەیە کە زیان و تاوان نەتوانن رووی تێبکەن، لە هەمانکاتدا هاوکارییکردن لەسەر چاکەو لە خوا ترسان دێنێتە دی، ئا بەمەش شەریعەت گەیشتووەتە ئەو شکۆمەندییە کە بەشەر هەرگیز نەتوانێت بگاتە ئەو ئاست و سنوورە.

**رووی سێیەم:** مەبەست لە شەریعەت رێکخستن و ئاراستە (توجیە) کردنی کۆمەڵە و پێکهێنانی کەسانی چاکە و پەیداکردن و دامەزراندنی دەوڵەت و

گێتییەکی نموونەییە. بە هۆی ئەمەشەوە دەقەکانی بە بەرزتر لە ئاستی سەرانسەری گێتیی رۆژگاری هاتنە خوارەوەی و ئەمڕۆشی هاتوون، بنەماو تیۆری وای تیایە کە گێتیی نا موسڵمان نەیزانیون و تاچەند سەدەیەك لەوەودوا پێیانەگەیشتووە، هەروەها هی تری وایشی تیایە تا ئێستاش گێتی ناموسڵمان ڕێی تێیان نەکەوتووە. بەهۆی ئەم بەرزیی و شکۆمەندییەوە خوای گەورە خۆی دانانی شەریعەتەکەی گرتە ئەستۆ و کردی بە یەك نموونەی تەواوەتی (الكمال) تا بەوە خەڵك ئاراستە بکات بەرەو ملکەچیی و کارچاکیی و پاڵیان پێوە بنێت بەرەو شکۆمەندێتی و کەماڵ بەشکو مرۆڤ نزیك ببێتەوە و بگاتە ئاستی تەواوی شەریعەتەکە.

بەڵام یاسا.. لە بنەڕەتا بۆ ئەوە دانراوە کە کۆمەڵ ڕێکبخات و بۆ ئاڕاستەکردنی دانەنراوە، ئاشکرایشە یاسا هەمیشە بە شوێن کۆمەڵدا ئەڕوات و لە کۆمەڵ دواکەوتووترە و وابەستەی پێشکەوتنی کۆمەڵە، بەڵام ئا لەم سەدەیەدا یاسا رووی لە بنەڕەتەکەی خۆی وەرچەرخێنرا، وای لێهات بۆ ڕێکخستن و ئاڕاستەکردنی کۆمەڵ دابنرێت، چونکە ئەو دەوڵەتانەی کە دەستیاندایە داهێشتنی بانگەوازی نوێ، دەستیان کرد بە بەکارهێنانی یاسا لە بواری ئاڕاستەکردنی گەلاندا بەرەو هەندێ رووگەی تایبەتیی و جێبەجێکردنی هەندێ مەبەستی تایبەتی، وەك روسیا و تورکیا و ئەڵمانیا و ئیتالیا و هتد... بەم جۆرەش لە کۆتاییدا یاسای دەستکرد گەڕایەوە و باوەشی کرد بەوەدا کە شەریعەت هەر لە سەرەتاکەیەوە پێش سیانزە سەدە دەستی پێکرد بوو.

## ئەو تایبەتمەندییە جەوهەرییانەی کە شەریعەت لە یاسا جیا ئەکەنەوە:

ئەتوانین لە بابەتەکانی پێشوو کورتەیەك وەربگرین و نیشانی بدەین کە شەریعەتی ئیسلام لە یاسا دەستکردەکان جیا ئەکرێتەوە بەم سێ تایبەتمەندییە جەوهەرییانە:

١ - **تەواوەتی ( الکمال )**: شەریعەتی ئیسلام شەریعەتێکی تێرو تەواوە، واتە لە بنەماو تیۆردا تەواو کراوە و کەموکورِیی تێدا نییەو دەوڵەمەندە لەو بنەماو تیۆرانەدا کە پێداویستی کۆمەڵ لە ئێستاو داهاتوودا دابین و جێبەجێ ئەکات.

٢ - **شکۆمەندیی و بەرزیی (ألسمو)**: شەریعەت دەستوور و بنەماکانی لە ئاستی کۆمەڵان، هەمیشە بەرزترن، بنەما و تیۆری وای تیایە کە ئەتوانێ هەمیشە ئەو ئاستە بەرزە بپارێزێ، هەرچەندە ئاستی کۆمەڵان بەرز ببێتەوە هەر نەیگاتێ.

٣ - **بەردەوامیی**: شەریعەت بەردەوام و هەمیشەییە و هەرچەندە ساڵ بێت و تێپەڕێ و رۆژگار درێژ ببێتەوە، بەڵام دەقەکانی شەریعەت قەبوڵ ناکەن دەستکاریی بکرێن و بگۆڕێن لە هەمانکاتدا باشی و چاکی خۆیان لە هەموو کات و شوێنێکدا ئەپارێزن.

## رێگەی شەریعەتی ئیسلام لە شەریعەتداناندا :

لە بنەڕەتا شەریعەت بۆ ئەوە هاتووە حوکمی خەڵك لە هەموو حاڵەتەکانیدا بکات و خەڵکیش لە کاروباری دنیا و ئاخرەتیدا حوکمی پێبکات، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شەریعەت بە شێوەیەکی درێژ بەیانی حوکمی بۆ هەموو حاڵەتێکی جورئیی و فەرعیی نەهێناوە و لەمەدا وەك یاسا دەستکردەکانی ئەمڕۆ نییە،

هەموو شەریعەت لە زۆربەی حاڵەتاندا ئەحکامی کوللی (کلی) لە شێوەی دەقی گشتیی و نەرمونیانیدا هێناوە، خۆ ئەگەر خۆی دابێت لە حوکمێکی فەرعییو دەقێکی بۆ دارشتبێ، ئەوە ئەو حوکمەش بە کوللی ئەژمێرێت، چونکە چەندەها حوکمی فەرعیی تری گرتووەتە خۆی.

## مافی کاربەدەست لە یاسادانانددا :

هەرچەندە شەریعەت مافی یاسا دانانی بەخشیوە بەکاربەدەست (أولی الأمر)، بەڵام ئەو مافە بەر بڵاوی بێسنوور نییە، بەڵکو ئەو مافە سنووردارە، ئەبێت هەر یاسایەك کە دایئەنێت رێك بکەوێت و بگونجێت لەگەڵ دەق و بنەما گشتییەکان و گیانی یاسادانانی شەریعەتەکەدا.

ئەم سنووردارییەی باسمان کرد لە مافی یاسادانانددا، مافی کاربەدەست لە دوو جۆری یاسادانانددا دابڕ ئەکات:

**أـ یاسادانانی جێبەجێکردن (التشريعات التنفيذية):**

مەبەست لەم یاسادانانەش مسۆگەربی جێبەجێکردنی دەقەکانی شەریعەتی ئیسلامە، یاسا دانانیش بەم شێوەیە وەك ئەو لەوائح و یاسایانە وەهایە کەوا ئەمرۆ وەزیران لە سنووری پسپۆڕیی خۆیاندا دەریان ئەکەن، بە مەبەستی مسۆگەرکردنی جێبەجێبوونی یاساکان.

**ب ـ یاسادانانی رێکخستن:**

مەبەست لەمانەش رێکخستنی کۆمەڵە و پاراستنیەتی و دابین کردنی پێداویستیەکانییەتی لەسەر بناغەی بنەماکانی شەریعەت، ئەم یاسادانانەش تەنها لەو بوارانەدا ئەبێت کەوا شەریعەت لێیان بێدەنگە و دەقی تایبەتیی

لەبارەیانەوە نییە، دیارە مەرجیش ئەوەیە ئەو یاسایانەی دائەنرێنت ئەبێت ڕێکبکەون لەگەڵ بنەما گشتییەکان و گیانی شەریعەتەکەدا.

## حوکمی دەرچوونی کاربەدەست لەسنوری مافی خۆی

ڕێککەوتن بەدەستهاتووە لەسەر ئەوەی کاری کاربەدەست مادام لە سنووری خۆیدا بێت، ڕاستە و دروستە، هەر کە لەو سنوورە دەرچوو ئیتر ناڕەوا و نادروستە، جا کاربەدەستان ئەو یاسایانەی کە ڕێکئەکەون لەگەڵ دەقەکانی شەریعەت و بنەما گشتییەکانی و ڕۆحە تەرشیعیەکەیدا، ئەگەر ئەمانەیان هێنا، ئەوا کارەکەیان ڕاستە و بە گوێکردنیان واجبە، خۆ ئەگەر لەوانەیان هێنا کە پێچەوانەی شەریعەتن، ئەوە کارەکەیان نادروستە، هەرچیش نادروست بیٚ نابێت کاری پێبکریٚ و بە گوێی بکریٚ.

ریشەی مەبەستەکە لێرەدایە: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ) (النساء: ٥٩)، (وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ) (الشورى: ١٠).

خوای گەورە واجبی ئەکات لە سەرمان کە بە گوێی فەرمانەکانی بکەین، واجبیشی ئەکات لە سەرمان بە گوێی پێغەمبەر و کاربەدەستمان بکەین، بە گوێکردنی خوا، بەپێی فەرمانی خوا واجبە، دیسان بە گوێکردنی پێغەمبەر و کاربەدەست بە فەرمانی خوا واجبە، نەك پێغەمبەر، یان کاربەدەست، خۆ هەرکە کاربەدەست چووە دەرەوە لە سنووری کێشراودا، ئەوا فەرمانی ناڕەوا ئەبێت و بەگویٚ کردنی ناواجبە.

پێغەمبەر ﷺ له فەرموودەکانیدا ئەو مانایەی بنج بەستکردووه و ئەفەرموێ: "لا طاعة لمخلوق فی معصیة الخالق" و "انما الطاعة فی المعروف" لەبارەی کاربەدەستەوه فەرموویەتی: "من أمرکم منهم بمعصیة، فلا سمع له ولاطاعة".

ئایا کاربەدەستان مافی خۆیانیان له سنووری خۆیا بەکار هێناوه؟

کاربەدەستانی وڵاتانی ئیسلامیی له سەدەی پێشووەوه دەستیانکرد بەدانانی چەندەها کۆمەڵه یاسا له هەموو رووەکانی یاسادانانەوه، بەو شێوازەی که ئەوروپاییەکان له وڵاتانی خۆیاندا کردیان، بەڵێ ئەو کاربەدەستانه له وڵاتەکانی خۆیاندا روویان کرده یاسا ئەوروپیەکان و چەندان کۆمەڵەی"دەستووریی، جینائیی، مەدەنیی و تجارییو.. هتد" لێهەڵگۆزاو نەقڵ کرد، بەبێئەوەی ئاوڕ له شەریعەتی ئیسلام بدەنەوه، جگه له هەندێ ورده مەبەستی وەك: وەقف و شیفعه.

جێی خۆیەتی دەریببڕین که زۆربەی دەقەکانی ئەو کۆمەڵه یاسایه لەگەڵ دەقەکانی شەریعەتدا ئەگونجێن و له بنەما گشتییەکانی دەرناچن، دیسان جێی خۆیەتی دەریببڕین که هەندێك دەق لەو کۆمەڵه یاسایانه پێچەوانەی ئەحکامی شەریعەتی ئیسلامن و لەسەر جۆره بنەمایەك راگیر بوون که پێچەوانەی بنەماکانی ئیسلامن، نموونەش بۆ ئەوه هەندێك دەقی یاسایین لەسەر سزادان، ئەو دەقانه له زۆربەی حاڵەتاندا رێگەی زینا دەدەن، هەروەها رێگەی عەرەق خواردنەوەش ئەدەن، له کاتێکدا شەریعەت زیناکردن و عەرەق خواردنەوەی حەرام کردووه به حەرامکردنێکی تەواو، کەچی یاسا ئەوروپیەکان رێگه ئەدەن، هەرچەنده رێگەدانەکەش بێسنوور نییه و گەلێك سنووری بۆ کێشراوه.

## هۆی گواستنەوەی یاسا ئەوروپییەكان بۆ وڵاتانی موسڵمان :

لەوانەیە هەندێك كەس وابزانن كە كاربەدەستان یاسای ئەوروپییان گواستۆتەوە بۆ وڵاتەكانیان ـ واتە وڵاتانی ئیسلام ـ ناچاریی ئەوەی پێكردوون و ئەو یاسایانە لە شەریعەتی ئیسلامدا دەستنەكەوتوون، ئەمەش گومانێكی هەڵەیە و لەسەر بنەڕەتی بێئاگایی و ناشارەزایی لە شەریعەتی ئیسلام راوەستاوە، چونكە لە شەریعەت و فیقهی ئیسلامییدا ئەوەندە بنەما و تیۆر و حوكم هەیە، ئەگەر بێتو بە شێوەی كۆمەڵ كۆمەڵ (مجموعات) كۆبكرێتەوە، بێگومان لە كۆمەڵانی یاسادا نموونەی هەرە بەرز ئەبێت، باوەڕم وایە ئەگەر ئەو یاسا ئیسلامییانە كاتی خۆی بە كۆمەڵ رێكبخرابان، وڵاتە ناموسڵمانەكان پێش پشتێك (جیلێك) لەمەوبەر ئەگواستەوە و وازیان ئەهێنا لەو كۆمەڵە یاسایانەی ئێستا هەیانە و شانازییان پێوە ئەكەن.

هۆی راستیەقینەی گواستنەوەی یاسا ئەوروپیەكان بەرەو وڵاتە موسڵمانەكان، ئیستعمارە، دەستەڵاتی ئەوروپایە، دانیشتن و خەواڵووچی زانا موسڵمانەكانە، هەندێك وڵاتی ئیسلامیی بە هۆی هێز و دەستەڵاتی داگیركەرەوە، یاسای ئەوروپایی بۆ گوێزرایەوە، وەك هیند و باكووری ئەفریقا، هەندێك وڵاتی ئیسلامییش بە هۆی لاوازیی خۆیەوە یاسای ئەوروپای هاتە ناویەوە، لە لایەكی ترەوە دەستەڵاتی بێگانە تیایدا بەهێز بوو و حوكمڕانانیش هەوڵی لاساییكردنەوەی وڵاتە ئەوروپاییەكانیان ئەكرد، لەوانە میسرو توركیا.

مێژوو چەسپاندوویەتی كە لە سەردەمی (خدێوی ئسماعیل)دا یاسای ئەوروپایی هاتە میسرەوە، خدێوی ئاواتی ئەوە بوو چەندان كۆمەڵە یاسای لە شەریعەت وەرگیراو دابنرێت بۆ میسر و ئەمەش لەمەزهەبە جیاوازەكانی فیقهی

ئیسلامیەوە سەرچاوە وەربگرێ، بەڵێ داوای کرد لە زانایانی (ئەزهەر) ئەو کۆمەڵە یاسایانە دابنێن، بەڵام داواو مەبەستەکەی درایە دواوەو رەفزیان کرد، چونکە دەمارگیریی مەزهەبیی نەیهێشت یارمەتی یەکتر بدەن لە دەرخستن و نیشاندانی شەریعەتدا لە جوانترین شێوە و وێنەدا، تێکڕای شەریعەتەکەیان کرد بەقوربانیی، هەر تاقمێك دەستیکرد بە پاراستن و دەمارگیرییکردن بەس بۆ مەزهەبەکەی خۆی، بەو جۆرەش چاکترین هەلێك کە هاتبێ و رەخسابێ بۆ گێتی ئیسلام و لەوەوبەر بۆی ئەگریان و بۆی ئەکڕوزانەوە گومیان کرد و لە دەستیاندا، هەقی خۆیشیانە بۆی بگرین تا بەشکو جارێکی تر بگەڕێتەوە.

حەز ئەکەم ئاگادارتان بکەم لەوەی کە هەندێك وڵاتی موسڵمان وەکە تاڕادەیەك بە ئارەزووی خۆی یاسای ئەوروپی هێنایە وڵاتەوە لەوەدا بە هیچ شێوەیەك مەبەستی سەرپێچیکردن نەبوو لە ئیسلام و شەریعەتەکەی، نموونەی هەرە چاکیش لەسەر ئەوە ئەمەیە یاسای سزادانی میسریی کە لە ساڵی (١٨٨٣)دا دەرچوو، لە دەقی ماددەی یەکەمییدا ئەمە هات: "لە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتە کە سزا بنوێنێ و بدات بەرامبەر بەو تاوانانەی ئەکرێتە سەر کەسان و ئەبنە هۆی لێڵکردن و شێوانی حەسانەوەی گشتیی، یان بەرامبەر ئەو تاوانانەی راستەوخۆ لە دژی حکومەت ئەنجام ئەدرێن، لەسەر ئەو بنەڕەتەش لەم یاسایەدا پلەی ئەو سزادانەی کە کاربەدەستان لە رووی شەرعەوە بۆیان هەیە بڕیاری بدەن دیاریی کراوە، ئەمەش بەبێئەوەی لە هیچ حاڵەتێکدا ببێتە هۆی شێوان، یان شلۆقکردنی مافێك لە مافە بڕیار لەسەر دراوەکانی هیچ شەخسێك کە شەریعەتی پیرۆز بڕیاری دابێت بۆی"، ئەم دەقە لە یاسای تورکیی وەرگیراوە کە لە ١٨٥٣/٦/٥دا دەرچووە.

بەپێی بیروڕاو بۆچوونی خۆم ئەتوانم بڵێم: کاربەدەستان لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامیەکاندا، چ لە کۆن و چ لە ئێستادا لەو رووەوە سەرپێچیکردن لە شەریعەتی ئیسلام قەت بە خەیاڵیاندا نەهاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەر سروشتی خودی یاساکان بە پێچەوانەی شەریعەت هاتووە، نهێنیی و پەنهانیی ئەوەش ئەمەیە: یا دانەری ئەو یاسایانە ئەوروپایی بوون و فرپیان بە شەریعەتەوە نەبووە، یان موسڵمانێك بوون کە یاسایان خوێندووە، کەچی شەریعەتیان نەخوێندووە.

## کاریگەریی یاساکان بۆسەر شەریعەت لە رووی کردییەوە:

لە ئەنجامی هاتنی ئەو یاسا ئەوروپییانەدا بۆ ناو وڵاتانی ئیسلامیی لەم وڵاتانەدا، چەندان دادگای تایبەتیی دامەزرا بۆ جێبەجێکردنی ئەو یاسایانە و دادوەر (قاضي)ی ئەوروپایی، یان خۆیی (وطنی) کە یاسای ئەوروپاییان خوێندبێت، بەڵام شەریعەتیان نەخوێندبێت دامەزراندن بۆ ئەو دادگایانە، ئەم دادگا تازانەش خۆیان لە هەموو شتێکدا ـ تەقریبا ـ بە خاوەن تایبەتمەندیی ئەزانی، بەرهەمی ئەوەش لە کارکەوتنی شەریعەت بوو لە رووی کردەییەوە، چونکە دادگا تازەکان جگە لە یاساکانی خۆیان، کار بە هیچ جۆرە یاسایەکی تر ناکەن.

هەروەها کاربەدەستان و سەرپەرشتیارانی خوێندن، قوتابخانەی تایبەتییان دروستکرد بۆ خوێندنی یاسا، ئەم قوتابخانانەش خەڵکیان راکێشا بەرەو بایەخدان بە یاساخوێندن و پشتگوێخستن و فەرامۆشکردنی شەریعەت، جگە لە چەند مەسەلەیەکی کەمی وەك وەقف نەبێت، ئەمەش سەری لەئەنجامێکی پڕ

لەسەرمەسارییەوە دەرهێنا، چونکە زۆربەی پیاوانی یاسا ــ کە لە گروهی رۆشنبیرانن ــ، بە تەواوی بێئاگا و بێخەبەر بوون لە ئەحکامی شەریعەتی ئیسلام و روانگەـ اتجاهات ــ گشتییەکان، واتە بە داخەوە نەزان و بێئاگای ئەحکامی ئیسلامن، لە کاتێکدا ئیسلام ئاینی هەموو ئەو وڵاتە موسڵمانانەیە! بێئاگایی لە شەریعەتەکە گەیشتە ئەو رادەیە و بووە هۆی ئەوە ئەو دەقە کەمانەش کە لە شەریعەتەکە وەرئەگیران بە جۆرێك تەفسیر بکرێن لەگەڵ گیانی یاسا دەستکردەکان بیگونجێن ئیتر چش لەوەی هەندێکجار لەگەڵ گیانی شەریعەتەکەدا بە گژ یەکدا بچن! ! نموونەش لەم رووەوە یاسای سزادان (قانون العقوبات)ی میسری بوو کە ئەیگوت، حوکمەکانی یاسای سزادان نابێت لە هیچ حاڵەتێکدا ببنە هۆی شێوان، یان شلۆقکردنی مافێك لەو مافانەی کە شەریعەتی ئیسلام بڕیاری لەسەر داون بۆ هەموو کەسێك، هەرچەندە ئەم دەقە بە راستە و روویی و قنجوقیتی هەبوو، بەڵام دادوەران و یاساناسانی میسریی لەو مافانەی کە شەریعەت بۆ کەسانی داناون بێئاگا بێخەبەرن، چونکە ئەوان هەر ئەو مافانایان ئەخوێند کە یاسای فەرەنسی بڕیاری داون و لەسەر شێوە و شەرحی فەڕەنسی ئەیانخوێندن، هەروەها لەسەر پایەکانی یاسای فەڕەنسی و لەسەر رێگەی هۆدۆزی (تعلیل)ی فەڕەنسی لە ماف ئەکۆڵانەوە، بێگومان یاساناسانی میسری لەم رێگایەدا لە ژێر گاریگەریی دوو هۆدا ملیان ناو بەرەو پێشەوە چوون:

**یەکەمیان:** ئەوانەی شەریعەتیان نەئەخوێند و لە ئەحکام و رووگە (اتجاهات)کانی هیچیان نەئەزانی.

**دووەمیان:** خۆیانیان ئەبەستەوە بە راو رووگەکانی یاساناسانی ئەوروپاوە بە گشتیی و فەرەنسیەوە بەتایبەتی، ئەوەی ئەوان رێیان پێنەدابایە ئەمانیش رێیان پێنەئەدا، ئەوەی ئەوان حەرامیان نەکردایە، ئەمان نەیانئەوێرا حەرامی بکەن، سروشتیشە کە یاساناسانی ئەوروپا هیچ شتێکیان لە شەریعەتی ئیسلام نەئەزانی.

## کاریگەریی یاساکان بۆ سەر شەریعەت لە رووی تیۆری (النظري) یەوە:

گەرچی یاسا دەستکردەکان لە رووی عەمەلییەوە بوون بە هۆی بێکارکردنی زۆربەی ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام، بەڵام لە رووی نەزەرییەوە ئەو یاسایانە هیچ کاریگەرییەکیان نەبوو بۆ سەر شەریعەت، ئەوەتا دەقەکانی شەریعەتەکە هێشتا هەر ماون‌و هەن، حوکمەکانیشی لەهەموو حاڵەکاندا ئەبێ جێبەجێ بکرێن، ئا ئەوە حوکمی شەریعەت و حوکمی یاسا کە پێکەوە کۆئەبنەوە، چونکە پایەی سەرەکیی لە شەریعەت و یاسادا بەم شێوەیە: دەقەکانی مەگەر دەقی وەك خۆیان و خاوەن هێزبن وەك خۆیان یان بەهێزتربن لە خۆیان بتوانن هەڵیانوەشێننەوە، واتە ئەبێ دەقانێك بن لە خودی یاسادانەرەکە، یا دەستەیەکی خاوەن دەستەڵاتی یاسادانان دەستەڵاتدارتر لە خاوەنی ئەو دەقانەی نیاز وایە هەڵبوەشێنرێنەوە، دەربچن، یان لە دەستەیەکەوە دەرچن کە دەستەڵاتی یاسادانانی زیاتر بێت لە دەستەڵاتی دانەری ئەو دەقانەی نیاز وایە هەڵوەشێنرێنەوە.

دەی ئەو دەقانەی کە بتوانن شەریعەت هەڵبوەشێننەوە ئەبێ قورئان، یان سوننەت بن، چونکە هەر تەنها قورئان و سوننەت ئەتوانن قورئان و سوننەت

هەڵوەشێننەوە. بێگومان لە دوای پێغەمبەر ﷺ قورئان نایەت، چونکە وەحی بڕاوەتەوە، خۆ ئیتر سوننەتیش کۆتایی هاتووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە، خۆ ناشکرێ بگوترێ ئەوەی لە دەستە و هەیئاتی یاسادانانی بەشەرییەوە دەرئەچێت لە پلەی قورئانو سوننەتدایە! یان بوترێ وەك خواو پێغەمبەر ﷺ دەستەڵاتی یاسادانانی هەیە! بەڵام ئەوەی کە ئەکرێ ـ راستی و واقعیش هەر ئەوەیە ـ کاربەدەستانمان مافی یاسادانانیان نییە، بەڵکو هەر مافی جێبەجێکردن و رێکخستنیان هەیە، ئەویش بەو شێوەیەی لەپێشدا رۆشنمان کردەوە، بەڵام یاسادانان هەر مافی خواو پێغەمبەرە، کاتی ئەوەش بە وەفاتی پێغەمبەر کۆتایی هات، بە کۆتاییهاتنی وەحییش، مەسەلەکە دەقی خۆی وەرگرتووە.

## حوکمی بەگژاچوونی یاساکان لەگەڵ شەریعەتدا :

ئەگەر ئەحکامی یاسا دەستکردەکان چوون بەگژ شەریعەتدا، واجبە حوکمی شەریعەت جێبەجێ بکرێت، نەك هی یاسا، ئەوەش لەبەر ئەم سێ هۆیە:

یەکەمیان: دەقەکانی شەریعەتی ئیسلام هێشتا خۆیان راگیر کردووە و هەر زیندوون، بە هیچ جۆرێك ـ وەك گوتمان ـ ناکرێت بخرێنە لاوە و دەسبەرداریان ببین، بەڵام دەقەکانی یاسا شیاوی هەڵوەشانەوەو تێکدانن، مانای ئەمەش ئەوەیە دەقەکانی شەریعەت لە دەقەکانی یاسا بەهێزترن.

دووەمیان: شەریعەت هەرچی بە پێچەوانەی بێت، بەتاڵ و ناهەقی ئەژمێرێ و قەدەغەی ئیتاعەکردنی ئەکات و ئەمەشمان روونکردەوە، واتە ئەو یاسایانەی

که پێچەوانەی شەریعەت بن بە نادروست و بەتاڵ ئەژمێررێن، نادروستیی و بەتاڵییەکی تەواو.

سێیەمیان: ئەو یاسایانەی پێچەوانەی شەریعەت بن، هەر بەوەی پێچەوانەی شەریعەتن لە ئەرك (وظیفه)ی خۆیان ئەچنە دەرەوە، یاسا ئەگەر لە ئەرکی خۆی چووە دەرەوە، بوون و نەبوونی وەك یەکە، بە پووچ و بەتاڵی تەواو دائەنرێت، تەنانەت یاسای دەستکردیش هەر خۆی بڕیار لەسەر راستی ئەم بابەتە ئەدات.

چۆن ئەو یاسایانەی کە پێچەوانەی ئیسلامن لە ئەرکی خۆیان چوونە دەرەوە؟

لە بنەڕەتا یاسا دەستکردەکان بۆ ئەوە دائەنرێن کەوا ئاتاجییەکانی کۆمەڵ بەجێبهێنرێن، کۆمەڵ رێکوپێك بکرێت، رژێمەکەی بپارێزرێت و ئارامیی و دڵنیایی و ئاشتی لە نێوان رۆڵەکانیدا بڵاو ببێتەوە. دەی گرنگترین ئاتاجی کۆمەڵ پاراستنی بیروباوەڕ (العقائد) و هەست و نەست و رژێمەکەیەتی. لە وڵاتە ئیسلامیەکانیشدا رژێمی کۆمەڵ لەسەر ئیسلام رائەوەستێ و بیروباوەڕی بەشی هەرە زۆری خەڵك لەسەر ئیسلامەتی راگیر ئەبێت. دەی بەپێی سروشت ئەبێت یاساکان بە جۆرێك بێنە مەیدانەوە کە زۆر زۆر گونجاو و جووت بن لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا، کەچی یاساکان بەم شێوەیە نەهاتن، بەڵکو وەك دیمان بە پێچەوانەی شەریعەت هاتنە مەیدانەوە. بە هۆی ئەمەشەوە یاساکان، نەك هەر تەنها بە دژ و پێچەوانەی شەریعەت هاتنە پێشەوە، بەڵکو لەو بنەڕەتانەش ترازان و چوونە دەرەوە کە ئەبێت یاساکان لەسەریان بینا بکرێن، لەو مەبەستانەی کە یاسا لە پێناویاندا دانراون ترازان و چوونە دەرەوە، ئەو

یاسایانەش لەسەر بنەڕەتی پاکیی زانراو راگیر نەکراون و مەبەستی پاکو رەوایان تێدا بەدیناکرێت.

ئێمە ئەگەر شتێك لە راستییەکان (حقائق)و ئەحکامی ئیسلام بزانین، ئەوسا بە ئاسانیی ئەزانینو تێئەگەین چۆن ئەو یاسایانەی کە لە ئەوروپادا دائەنرێن بۆ بەختیارکردنی کۆمەڵ و بڵاوکردنەوەی ئارامیی و ئاشتی لە نێوان رۆڵەکانیدا، هەر ئا ئەو یاسایانەن کە لە وڵاتە موسڵمانەکاندا ئەبنە مایەی ئەزیەت نۆشینی کۆمەڵی موسڵمانان و هەستیان برینددار ئەکەن و سنگیان ئەکزێننەوە، ئەمەش یەکەمین هۆیە کە پاڵ بە بەشی هەرە زۆری موسڵمانانەوە ئەنێ بۆ دەربڕینی ناڕەزایی بەرامبەر بەو یاسایانە، بەڵکو ئەمەش یەکەمین هۆی کاریگەرە کە ئاژاوە و ناکۆکیی بەرپا ئەکات:

١ـ ئیسلام رێگە نادات بە موسڵمان لە غەیری شەریعەتی خوا یاسا پەسەند بکات بۆ خۆی، هەرچیەکیش لەدەقەکانی شەریعەت، یان بنەما گشتییەکانی، یان گیانی یاسادانانی ئیسلام بەدەر بێت ئەوە بە دەقی راستەوخۆی قورئانیی بە تەواوەتی لەسەر موسڵمان قەدەغە و حەرامکراوە. خوای گەورە کار و مەبەستەکە دابەش ئەکات بە دوو بەشەوە، کە سێیەمی نەبێت، کە یان بە گوێکردنی خوا و پێغەمبەر و شوێنکەوتنی شەریعەتەکەی پێغەمبەرە، یان شوێنکەوتنی هەوەسە. هەرچی پێغەمبەر نەیهێنا بێت، ئەوە ئارەزوو و هەوەس هێناویانە، ئەمەش بەپێی فەرموودەی خوا: (فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ اللَّهِ) (القصص: ٥٠) و (ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاء الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ) (إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً وإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ)

(الجاثية: ١٨ـ ١٩) وە ئەفەرمێ: (اتَّبِعُواْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلاَ تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء قَلِيلاً مَّا تَذَكَّرُونَ) (الأعراف : ٣ )

٢ـ خوای گەورە بڕیاری نەداوە کە خاوەن باوەڕ رازیبێت بە حوکمی غەیری خوا، یان حوکم بکات بەوەی کە خوا بڕیاری لەسەر نەداوە، بەڵکو خوا فەرمانی کردووە بە باوەڕدار کە بە هەموو حوکمێك جگە لە حوکمی خوا کافر بێت، خوا رازیبوونی بەندەکانی بە حوکمی کەسێ، یان کەسانێکی تر، بە گومڕایی ئاشکراو شوێنکگەوتنی شەیتان ئەژمێرێ، ئەمەتا ئەفەرموێ: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيداً) (النساء: ٦٠ ).

هەر کەس بچێتە پەنای حوکمێك، ئەو حوکمە هی خوا نەبێت و ئەوە نەبێت کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، بێگومان ئەو کەسە ملهوڕیی کردووە بە حاکمی خۆی و قبوڵی کردووە، ملهور (طاغوت) چیە؟ هەرچیەك بەندە لە سنووری خۆی بترازێنێ، ئەوە ملهورە، ئیتر ئایا پەرستراو بێت، یان شوێنکەوتوو (متبوع)، یاخۆ بەگوێکراو بێت، ملهوڕی هەر قەومێك ئەوەیە کە شوێن حوکمەکەی ئەکەون ـ حوکمەکەشی هی خواو پێغەمبەری خوا نییە ـ، یان ئەیپەرستن، یان بەبێ مۆڵەتی خوا شوێنی ئەکەون، یاخۆ ئیتاعەی ئەکەن لەو شتە، یان لەو شتانەدا کە ئیتاعەی تێدا حەرامە، کەسێك باوەڕی بە خوا هێنا، ئیتر بۆی نییە باوەڕ بە غەیری خوا بهێنێ، یان حوکمێك جگە لە حوکمی خوا قبوڵ بکات.

٣– خوای گەورە بۆ باوەڕدار (چ نێرو چ مێ) وای بڕیار نەداوە شتێك هەڵبژێرن بۆ خۆیان کە خواو پێغەمبەر ﷺ بۆیانی هەڵنەبژاردبێت، ئەمەش فەرمایشتی

خوایە: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ) (الأحزاب : ٣٦ )

٤- خوا فەرمانی داوە حوکم بە دەقی ئەوە بکرێت کە ناردویەتیە خوارەوە، کەسێکیش حوکم نەکات بەوەی خوا ناردوویەتی، خوا بە کافر و زالّم و فاسق ناوی بردووە و ئەوەتا ئەفەرموێ: (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة : ٤٤). (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (المائدة : ٤٥). (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) (المائدة:٤٧ ). تەفسیرکەران و فەقیهان رێکەوتوون لەسەر ئەمە: هەر مسوڵمانێك هەر شتێك دابنێت ـ واتە هەر حوکمێك دابنێ ـ، جگە لەوەی خوا ناردوویەتی، بە هۆی حوکمکردن بەم حوکمە وازبێنێ لە حوکم کردن بەوەی خوا ناردوویەتی، یان واز لە بەشێکی بێنێ بەبێ تەئویل بڕوای هەبێ بەراستیی داهێنراوەکە، ئەوا بەپێی حاڵەتی خۆی ئەچێتە ژێر رکێفی حوکمەکەی خواوە. ئەو کەسەی دەستهەڵگرێ لە (حەد)ی دزی و داوێنپیسیی و زینانانەمل (القذف) ـ بۆ نموونەـ، چونکە حوکمێکی تری بەشەریی لە ئەم بە چاکتر و گونجاوتر ئەزانێ دەی بەبێ یەك و دوو ئەمە کافرە. کەسێك حوکم بە (ماأنزل الله) ناکات، بەڵام نەك بە هۆی نەبوونی ئیمان پێی، یان نەك بە هۆی ئینکاریکردنی حوکمەکە، ئەمەیان (ظالم)ە، ئەگەر هاتوو لە حوکمەکەیا حەقێکی کرد بە ژێرەوە، یان دادگەریی یاخود یەکسانییەکی پەڕاند، یان شاردیەوە، ئەگەر وەها نەبێت، دیارە فاسقە.

٥- خوای گەورە نەفی بوونی ئیمان ئەکات لە بەندەکانیا هەتا لە ناکۆکیەکانیاندا پێغەمبەر ﷺ نەکەن بەحەکەم و رازی نەبن بەحوکمەکەیی و گەردن کەچنەکەن بۆ حوکمەکەو بەتەواوی خۆیان نەدەن بە دەستەوە،

بەبێئەوەی شتێك له دڵ و دەرونیاندا بمێنێتەوە سەبارەت بە راستیی و دروستیی ئەو حوکمە. ئەفەرموێ: (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً) (النساء : ٦٥ ).

٦- هەرچی پێچەوانەی شەریعەت بێت لە موسڵمانان حەرامە. گەرچی حوکمڕانانیش ئەمری پێبکەن و رەوای بکەن و حوکمڕانانیش هەر کەس و هەر جۆر بن، چونکە مافی دەستەی حوکمڕانان لە یاسادانانندا سنووردارە "مقید"ە بەوەی یاسادانان ئەبێت گونجاو بێت لەگەڵ دەقەکانی شەریعەتدا، گونجاو بێت لەگەڵ بنەما گشتییەکانی و گیانی یاساغدانانیدا، جا ئەگەر دەستەی حوکمڕان رێی بە خۆیدا لەو سنوورانە بچێتە دەرەوە، دەی ئا بەو چوونە دەرەوەیە یاسا حەرامەکان حەڵاڵ نابن، رێگایش ناکرێتەوە بۆ موسڵمانان کە شوێنیان کەون، یان جێبەجێیان کەن، بەڵکو لەسەر هەموو موسڵمانێ واجبە یاخی ببێت لەم یاسایانە و نەهێڵێ پەیڕەویی بکرێن یان جێبەجێ بکرێن، چونکە لەو حاڵەتەدا بەگوێکردنی کاربەدەست بە هیچ شێوەیەك واجب نییە، بەڵکو لەو سنوورەدا واجبە کە خوا و پێغەمبەر دیاریانکردووە: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ) (النساء: ٥٩) و (وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ) (الشورى: ١٠).

هەروەها سوننەتیش سنووری ئیتاعەی دیاریکردووە. پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەفەرموێ: "لاطاعة لمخلوق فی معصیة الخالق". و "انما الطاعة فی

المعروف". سەبارەت بە کاربەدەستانیش: "من أمرکم منهم بمعصیة فلا سمع له ولا طاعة."

بەڵێ، یارانی پێغەمبەر و فەقیهانی ئوممە و موجتەهیدەکانی لەسەر ئەمە یەکیانگرتووە کە بە گوێی کاربەدەست تەنها لە سنووری بەگوێکردنی خوادا ئەبێ بکرێ، لە نێوانیاندا ناکۆکیی و جیاوازیی نییە لەوەدا کە نابێت لە سەرپێچییکردنی خالقدا بە گوێی مەخلوق بکرێت "لاطاعة لمخلوق فی معصیة الخالق"، هەموویان بە کۆمەڵ فەتوا و بڕیاری حەرامیی ئەو ئیتاعەیان داوە وەك حەرامی زینا و مەی خواردنەوە و ڕێگەدان بە هەڵوەشاندنەوەی حوکمی "حدود" و لەکارخستنی حوکمەکانی شەریعەت، یاخۆ دانانی یاسایەك کە خوا پێی رازی نەبێت، ئەوەش کوفر و پاشگەزبوونەوەیە، چوونە دەرەوە لە ئیتاعەی حاکمی موسڵمان ئەگەر پاشگەز بووەوە لەسەر موسڵمانان واجبە، نزمترین پلەی چوونە دەرەوەش لە ئیتاعەی کاربەدەست سەرپێچیکردنە لە فەرمان و نەهیەکانی، دیارە ئەوانەیان کە پێچەوانەی شەریعەت بن.

٧ـ ئەحکامەکانی شەریعەت پارچە پارچە نابن و لە یەکتر جیانابنەوە، نابێت و ناکرێت موسڵمان رازی بێت بە جێبەجێکردنی "تطبیق"ی هەندێك و هەندێکی تریان پشتگوێ بخات، لەمەوبەر ئەم باسەمان بە بەڵگەوە باسکرد.

ئەوانەی باسکران بەشێکن لە راستی (حقائق)ی ئیسلام، بەو دەقە قورئانیانەوە، بەو دەقە سوننەتیانەوە کە بینیتان، ئەمەش ئەو واقیعەیە کە موسڵمانێك لە ئیسلام تێبگات و بڕوای هەبێت بە ئیسلام تێی کەوتووە و تیایا ئەژی، ئەبێت هەموو موسڵمانێك هەستی پێبکات و کاریشی بۆ بکات، دەی یاساکان کە لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە دانراون هەست و بیروباوەڕەکان (المشاعر والعقائد) بپارێزن،

ئەم یاسایانە لەگەڵ هەست و بیروباوەڕەكاندا ئەجەنگێن و دەستدرێژییەكی ناڕەواو ناشیرینیان ئەكەنە سەر، بەوەی كە بە پێچەوانەی شەریعەت هاتوون، هەروەها خەڵكیی پەست و ناڕەحەت ئەكەن، چونكە جۆرە بارودۆخێك بەسەر خەڵكا ئەسەپێنن كە پێچەوانەی شەریعەتن و ئیسلام بە توندیی حاشایان لێدەكات.

بەو جۆرەی كە باسمانكرد ئەتوانین بڵێین: گواستنەوەی یاسا دەستكردەكان بۆ ناو وڵاتە ئیسلامییەكان، یاساكان لەوەركی خۆیان ئەكەنە دەرەوە ئەبنە هۆی وروژاندنی دەروونەكان و خراپە خستنەوەو ئەزیەتدانی هەستی گشتلا (العام)، ئیتر یاساكان ئەبن بە ئامرازێكی لەبار بۆ هەڵگیرساندنی ئاژاوە، ئەبنە وەسیلەیەكی كاریگەر بۆ بڵاوكردنەوەی سەر لێشێوان و هەراو بەزمو بالۆرە و چەواشەكردن.

# بەشی دووەم

# موسڵمانان چەندێ شەریعەتەكەیان ئەناسن؟

موسڵمانان لە رووی ناسینی شەریعەتەكەیانەوە هەموویان وەك یەك نین و بەپێی بارودۆخی ژیانیان و پلە و ئاستی رۆشنبیرییان لە یەكتر جیاوازن، لەم رووەوە ـ ناسینی شەریعەت ـ ئەبن بە سێ بەشەوە: یەكەمیان، نارۆشنبیران (غیر المثقفین). دووەمیان، رۆشنبیران بە رۆشنبیری ئەوروپا، سێیەمیان، رۆشنبیران بە رۆشنبیریی ئیسلامیی.

دەی با لێیان بدوێین:

**١ـ كۆمەڵی نارۆشنبیران:**

ئەمانە نەخوێندەواران و ئەوانەش كە كەمێك رۆشنبیرن، بەڵام رۆشنبیرییەكەیان وانییە بتوانن تێبگەن لەوەی تێی ئەكەون و تووشی ئەبن، ئەگرێتەوە، ناشتوانن حوكمێكی راست بدەن بەسەر رووداوەكاندا. ئەمانە جگە لە زانیارییەكی هەرەمەكیی لە رووی عیباداتەوە، ئیتر هیچ لە شەریعەتی ئیسلام نازانن و زۆر بێئاگان لێی، زۆربەشیان بە شێوەیەكی ئالیی (بصورة آلية) خواپەرستیی ئەكەنو شوێن بابو باپیرانو برایانیان و مەلا و شێخەكانیان كەوتوون، مەگەر بە دەگمەن ببینی هەیان بێت لە بەجێهێنانی عیبادەتدا پشت بە لێكۆڵینەوە و دیراسە و زانیاریی خۆی ببەستێ.

زۆربەی موسڵمانان لەم بەشەنو رێژەكەشی ئەگاتە (٠/٠٨٠)ی تێكرای موسڵمانانی گێتی، ئەم كۆمەڵە بەرێرەو و بۆچوونی رۆشنبیران زۆر زۆر كاری تێئەكرێت، ئیتر رۆشنبیرییەكە چ ئیسلامیی بێت یان ئەوروپیی. لە هەر شتێكا بزانن پەیوەندی هەیە بە ئیسلامەوە، شوێن ئاراستەكاری (توجیهات)ی ئەو

رۆشنبیرانە ئەکەون کە هەڵگری رۆشنبیری ئیسلامیین، چونکە ئەمانە بە ئاسانیی لە مەسائلی ئیسلامیی تێئەگەن، بەڵام لەو شتانەدا نەتوانن پەی ببەن بەوەی کە بەستراوە بە ئیسلامەوە، یان نا، گەردنکەچیی ئاراستەکاریی رۆشنبیران ـ بە رۆشنبیری ئەوروپی ئەبن.

زانایانی ئیسلام ئەگەر بتوانن کەسانی ئەم کۆمەڵ و بەشە تێبگەیەنن لەوەی کەوا هەموو کاروبارێکی ژیان وابەستەیە بە ئیسلام، ئەگەر هەموو کاروبارێکی ئەم دنیایەیان لەسەر بنچینەی شەریعەتی ئیسلام نەبەن بەڕێوە، ئیمانیان دانامەزرێ و ناتەواو ئەبێت، ئەگەر زانایان بتوانن ئەوە بکەن، ئەوسا زۆر بە ئاسانیی ئەتوانن بە جوانیی و پاکیی ئاراستەی ئەو بەش و کۆمەڵە بکەن و دەستبگرن بە سەریدا بە تەواوی، بەوەش ئەبنە موڵکی ئیسلام.

بەڵام زانایانی ئیسلام لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامییدا ئەم بەشە گەورە و فراوانە پشتگوێ ئەخەن و بەری ئەدەنە بەر گورگی نەزانیی و ئەویش لە موسڵمانەتی ڕوو وەرئەچەرخێنێ بەبێئەوەی هەست بە گومڕایی خۆی بکات، بەڵکو وا ئەزانێ کە لەسەر رێگەی راستی دوور لە مەترسییە، بەراستی هۆی گومڕایی و سەر لێشێواویشی تەنها بێدەنگیی ئەوانەیە کە کاروباری ئیسلامیان وا بەدەستەوە، تەنها پاڵدانەوەیانە.. کەمتەرخەمییانە لە بەجێهێنانی بانگەوازی ئیسلامییدا.

**٢ـ کۆمەڵی رۆشنبیران بە رۆشنبیریی ئەوروپا :**

ئەم کۆمەڵە بەشی هەرە زۆری رۆشنبیرانی وڵاتانی ئیسلامیی ئەگرێتە خۆی، زۆرێکیان لە رۆشنبیرییدا مامناوەندیین، زۆرێکی تریان لەوەدا بەرز و بڵندن. لەوانە: دادوەران (القضاة)، پارێزەران، پزیشکان، ئەندازیاران، وێژەوانان، پیاوانی پەروەردە و فێرکردن و بەڕێوەبردن و رامیاریی.

ئەم بەشە لەسەر شێوە و شێوازی ئەوروپاییانە رۆشنبیریی وەرگرتووە، لەبەر ئەوەش لە شەریعەتی ئیسلام بە قەد ئەو کەسە ئەزانن کە لە دەوروبەر و مەڵبەندەکەی شتی وەرگرتووە، ئەو رۆشنبیرانە لە عیباداتی یۆنان و رۆمان، لە یاسا و رژێمە دەستکردەکانی ئەوروپا گەلێ شارەزاییان هەیە، بەڵام لە شەریعەتی ئیسلام ناشارەزاو بێخەبەرن.

لە هەر وڵاتێ لە وڵاتانی ئیسلامدا، چەند کەسانێ هەن لەم بەشەو بە پەنجەی دەست ئەژمێررێن، کە لە بەشێکی تایبەت لە بەشەکانی شەریعەتدا دیراسەیان هەبێ، کەچی ئەوەش بە شێوەی رووکەش واتە (سطحی)، نەك بەشێوەیەکی وردو قوڵ، دیراسەیەکی سنووردار، نەك بەربڵاو، تەنانەت لەناو ئەوانەشدا دانە دانەیەکیان هەن کە لە راستیی رۆحی شەریعەتی ئیسلام تێگەیشتبن و هەواڵ و خەبەری ئیجتهادات (اجتهادات) و بناغەکان کە ئیسلامیان لەسەر وەستاوە، بزانێت.

ئا ئەو رۆشنبیرانە بە رۆشنبیریی ئەوروپا کە تا ئەم رادەیە لە ئیسلامو شەریعەتەکەی بێئاگان، ئا ئەوانەن کە دەستیان کێشاوە بەسەر نەتەوەی ئیسلامدا، ئەوان لە رۆژهەڵاتان و خۆرئاوایاندا ئاراستەی ئەکەن، ئەوانەن ئەبنە نوێنەری ئیسلام و موسڵمانان لە کۆمەڵگا نێودەوڵەتیەکاندا!!

وا چاکە بەرامبەر بەوانە بە ئینساف بین و دەریببڕین ئەوانە گەرچی بێئاگان لە شەریعەتی ئیسلام کەچی بە ئایین و خاوەنی ئیمانێکی قوڵن و بەپێی لێزانینی خۆیان عیبادات بەجێئەهێنن، ئامادەیی تەواویان هەیە بۆ فێربوونی ئەوەی کە نایزانن، بەڵام خۆیان بە تەنها نایزانن فێری بن، بۆچ؟ چون لەگەڵ خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانەدا رانەهاتوون، دیسان توێژینەوە (البحث) لە کتێبەکانی

شەریعەتدا ئاسان نییە سامەگەر بۆ ئەوانەی کەوا بە درێژیی راهێنیانیان لەسەر خوێندنەوەی کردبێت. ئەو کتێبانە لەسەر دەستووری هەزار ساڵ لەمەوبەر دانراون‌و بەو شێوەیە بەش بەش (تبویب) نەکراون کە بە ئاسانیی کەڵکیان لێوەربگیرێت، کەسێك بیەوێ بگەڕێ بە دوای چارەسەری مەسەلەیەکدا، هەروا بە ئاسانیی و خێرایی بۆی نادۆزرێتەوە، بەڵکو ئەبێت بەش بە دوای بەشدا بیخوێنێتەوە، تا ئەکەوێت بەسەر مەبەستەکەدا، جاری واش ئەبێت ئەو کەسە ماندوو ئەبێت و کۆڵ ئەدات، لە دواییدا خوا بۆی رێکئەخات بەبێ پێشبینی کردن لە شوێنێکدا ئەیدۆزێتەوە، هەروەها بە زۆریی خوێنەر ناگاتە مەبەست و حەقیقەت، چونکە زاراوە شەرعییەکان نازانێ، لەو بنەما و بنچینانەی کە مەزهەبە فیقهیەکانی لەسەر دامەزراوە نازانێ.

بەڵێ، من کەسانێکی زۆر ئەناسم زۆر بەگەرمیی تێکۆشان کە دیراسەی شەریعەتی ئیسلام بکەن، کەچی لێی تێنەگەیشتن و مێشکیان ماندوویێتی بۆ مایەوە، هەرچی گەرموگوڕیی‌و عەزمێك کە هەیانبوو لە نێوان دەق‌و شەرح‌و پەڕاوێزەکان (المتون والشروح والحواشی)دا گوم بوو. خۆ ئەگەر ئەوانە کتێبی شەرعییان دەستبکەوتایە، بەڵام کتێبانێ کە لەسەر شێوەی نووسینی تازە نووسرابان، بێگومان ئەیانتوانی بە ئاسانیی دیراسەی شەریعەت بکەن و سوودمەند ببن و سوودیش بە خەڵك بگەیەنن.

لە لایەکی ترەوە رۆشنبیران بە رۆشنبیریی ئەوروپا، هەندێکیان داوا (ادعاءات)ی سەیریان دەربارەی شەریعەت هەیە، بگرە داواکانیان جێی پێکەنینن، هەندێکیان ئەڵێن: ئیسلام پەیوەندیی نییە بە حوکم و دەوڵەتەوە، هەندێکیان ئیسلام بە دین و دەوڵەت ئەزانێ، بەڵام لایان وایە شەریعەتی ئیسلام لە رووی ئەحکامی

دنیاوە لەگەڵ ئەم چەرخەدا ناگونجێت، هەندێكی تر رایان وایە شەریعەتع لەگەڵ ئەم چەرخەدا ئەگونجێت، بەڵام لایان وایە هەندێك لە حوكمەكانی كاتیین و ناكرێت ئەمڕۆ جێبەجێ (تطبیق) بكرێن، هەندێكی تر رایان وایە كە شەریعەت بۆ ئەم چەرخە ئەشێتو حوكمەكانیشی هەمیشەیین، بەڵام هەندێ لە حوكمەكانی لە توانای جێبەجێكردندا نین، چونكە دەوڵەتە بێگانەكان قەڵس و تووڕە ئەكەن. هەندێكی تریشیان رایان وەهایە: فیقهی ئیسلامیی زیاتر سەر بە رای فەقیهەكانە، لەوەی كە سەر بە قورئان و سوننەت (السنة) بێت.

ئا ئەوە داوا بەناوبانگەكانیانە، بەراستیی ئەو داوایانەش هیچ نرخێكیان نییە، چونكە لە كەسانێكەوە هاتوون كە لە شەریعەت نەزان و بێئاگان، كەسێكیش شتێ نەناسێ و حوكمیشی بە سەردا بدات، دیارە حوكمەكەی نابەجێیە و لەسەر بنەڕەت راگیر نەبووە و بێبەڵگەیە و ئەڕووخێت.

**لە راستییدا ئەو هەموو داوایانەش ئەگەڕێنەوە بۆ دوو هۆ:**

**یەكەمیان**: نەناسینی شەریعەت.

**دووەمیان**: رۆشنبیریی ئەوروپا كاری تێكردوون، ئیتر هەوڵ ئەدەن ئەو زانیاریی (معلومات)ەی هەیانە لە یاسا دەستكردەكاندا بیتەپێنن بەسەر شەریعەتی ئیسلامدا. دەی خۆ دژیەتیی (تناقص)ی نێوان خاوانانی ئەو داوایانە، چاكترین بەڵگەیە لەسەر پوچەڵییان، چونكە هەر كۆمەڵێك لەو داوایانە دژ و مێملێ كۆمەڵێكی تریانە، ئەوەی هەندێكیان بینای ئەكەن، هەندێكی تریان ئەیڕوخێنن، ئێمەش هەوڵئەدەین بە یارمەتی خوا یەكە یەكەی ئەو داوایانە بخەینە بەر نەشتەری باس و پوچەڵییان نیشان بدەین.

**یەکەم: ئەو داوایەی ئەڵێت ئیسلام پەیوەندیی نییە بە حوکمەوە:**

هەندێك لەوانەی کە رۆشنبیر کراون بە رۆشنبیریی ئەوروپا ئەڵێن ئیسلام ئایینە، ئایینیش پەیوەندییەکە لە نێوان مرۆڤ و پەروەردگاریدا، ئیتر پەیوەندیی بە حوکم و دەوڵەتەوە نییە، بەڵام ئەگەر لەوانە بپرسیت: ئایا ئەو رایەتان لە قورئان و سوننەتدا هیچ رەگ و پاڵپشتێکی هەیە؟ قوڕوقەپ ئەکەن و ناتوانن وەڵامت بدەنەوە، چونکە لەم داوایانەیاندا هیچ جۆرە پاڵپشتێکیان نییە بگەڕێنەوە بۆ لای و پاڵی پێوە بدەن، جگە لەوەی لە رۆشنبیریی ئەورووپاوە ئەوەیان وەرگرتووە، یان لەوەی کە ئەبینن لە ئەورووپادا ئایین لە دەوڵەت دوورخراوەتەوە.

بەڵێ، ئەوانە دیراسەکەیان کارێکی وەهای کردۆتە سەریان، وا ئەزانن ئەوەی فێری بوون تەتبیق ئەبێت بەسەر هەموو وڵاتێکدا، لەگەڵ هەموو رژێمێکا ئەگونجێ و پیادە ئەبێت، ئەمانە ئەگەر ژیر بوونایە ئەیانزانی کە یاسا دەستکردەکان و رۆشنبیریی ئەوروپا نابێت بکرێت بە سەنگی مەحەك لەو مەسەلەیەدا، بەڵکو تەرازوو و سەنگی راستەقینە لەم رووەوە ئەبێت هەر خودی رژێمی ئیسلام خۆی بێت.

ئەوسا ئەگەر بینیان ئەم رژێمە دین و دنیا لەیەك جیا ئەکاتەوە، دیارە داواکەیان راستە. خۆ ئەگەر ئیسلام دین و دنیای کۆکردەوە و ئامێتەی یەکتری کردن، خواپەرستیی و سەرۆکایەتی تێکەڵ بە یەکتر کرد، مزگەوت و دەوڵەتی وەکو یەك گرتە باوەش، بێگومان داواکەیان پووچەڵ و نادروستە، بەڵکو بۆ هەڵبەستن و بوختانەیش.

چەند ساڵێك لەمەوبەر دانیشتنێك لەگەڵ چەند گەنجێکدا کە خوێندنیان لە یاسا لە میسر تەواو کردبوو کۆی کردمەوە، باس چووە سەر ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام، دیتم باوەڕیان وایە کە ئیسلام پەیوەندیی نییە بە کاروباری حوکم و دەوڵەتەوە، منیش دەستم کرد بەڕاستکردنەوەی ئەو هەڵەیە بۆیان، سەرزەنشتیشم کردن لەسەر ئەو بنەڕەتەی کە ئەوان پیاوانی یاسان و ئەبێ تێگەیشتوو بن‌و چۆن ئەبێ ئەو حوکمە بدەن بەسەر ئیسلامدا کە گوایە دین و دەوڵەت کۆناکاتەوە! ئاخر بەڵگەیان ئەبێ چی بێ؟ کام بەڵگەی ئیسلامیی بۆچوونەکەیان ئەسەلمێنێ؟ یەکێکیان قسەکەمی پێبڕیم‌و گوتی: ئادەی تۆ دەقێکی قورئانییمان بۆ بێنەوە، بەڵام دەقەکە قورئانیی بێت، نەك شتێکی تر، بیێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئیسلام دین و دەوڵەت کۆئەکاتەوە. خێرا تێگەیشتم چی ئەوەێ. گوتم ئەی بە دەقێکی سوننەت رازی ئەبیت؟ گوتی نەخێر، چونکە قورئان دەستووری ئیسلامە، تەماشای برادەرەکانمی کرد، دیتم قسەکەی ئەویان زۆر بە دڵ بوو.

سەبارەت ئا بەو گەنجانە زۆر سەرم سوڕما! ئەوانە باوەڕیان بە قورئان زۆر بەتینە، کەچی هەر زۆر زۆر لە قورئان بێئاگان! !منیش بۆ ئەو موسڵمانانە ماتەمییەکی زۆر دایگرتم، چونکە بێئاگاییان لە قورئان بردوونی بەرەو ئینکاریکردنی دوو حوکم لە ئاشکرا (ظاهر)ترین ئەحکامی قورئان کە ئەمانەن:

١– ئیسلام دین و دەوڵەت تێکەڵ ئەکات.

٢–سوننەتیش هەروەکو قورئان بەڵگە و حوججەیە بەسەر هەموو موسڵمانێکەوە.

ئەو گەنجە موسڵمانانە کە باوەڕیان بە قورئان هەیە، بێئاگان لەوەی کە دەقی قورئانە هاتووە بۆ سزادانی پیاوکوژ و ڕێگرانی ڕێی هەق و دز و زیناکەر و بوختانکەر. ئەها ئەفەرمویٚ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى) (البقرة: ١٧٨ (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلاَّ خَطَئاً وَمَن قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَئاً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ). (النساء: ٩٢)، (إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ) (المائدة: ٣٣). (وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا) (المائدة: ٣٨)، (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ). (النور: ٢). (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً) (النور: ٤).

هەروەها چەندەها دەقی تری زۆر و زەبەندە هەن کەوا کە کۆمەڵێکی زۆر تاوان حەرام ئەکەن و سزاکانیان دیاریی ئەکەن، چ بە سزای سنووردار: وەك سزادانی پاشگەز بوونەوە، یان بە سزای (تعزیر) واتە سنوور بۆنەکراو وەك سزادانی جنێو (السب) و ناپاکیی کردن لە سپاردەدا.

ئەم تاوانانە قورئان، حەرامی کردوون، ئەو سزایانەش هەر قورئان واجبی کردوون، دەی حەرامکردنی تاوان و واجبکردنی سزادان مەسەلەیەکن لە مەسەلەگەلی حوکم، نەك مەسەلەیەك بن لە مەسەلەگەل ئایین وەك ئێوە بۆی ئەچن، خۆ ئەگەر ئیسلام دین و دەوڵەتی تێکەڵ نەکردایە ئەم هەموو دەقانەی تێدا نەئەهات، دەی مادام قورئان پێویستی کردووە لەسەر موسڵمانان کە ئەو دەقانە راگیرو جێبەجێ بکەن، دیارە هەر بەوە واجبی کردووە لەسەریان کە دەوڵەتێك دابمەزرێنن، حکومەتێك دابمەزرێنن کە کاری ببێتە جێبەجێکردن و

پیادەکردنی ئەو دەقانە، دیارە دامەزراندنی ئەو حکومەت و دەوڵەتە بەشێکە لە بەجێهێنانی واجبەکە.

هەروەها قورئان واجبی کردووە کە حوکم لەسەر بنچینەی راوێژ (الشوری) دامەزرێت، خوا ئەفەرموێ: (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) (آل عمران: ١٥٩) هەروەها فەرموویەتی: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ) (الشوری: ٣٨). دیارە دامەزراندنی راوێژکارییش پێویستی بە دامەزرانی حکومەت و دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەیە، دەی خۆ ئەگەر ئیسلام دین و دەوڵەتی لە یەکتر جیا بکردایەتەوە، نە باسی شێوەی حکومەتی ئەکرد و نە جۆری حوکمەکەی باس و دیاریی ئەکرد.

دیسان قورئان واجبی کردووە کە حوکم کردن لە بەینی خەڵکدا ئەبێت بە دادگەرانە بێت، خوا ئەفەرمێ: (إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ) (النساء: ٥٨) وە ئەفەرموێ: (وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ) (المائدة: ٤٩). ئەفەرموێ: (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: ٤٤) بێگومان حوکم کردن گرنگترین کارێکە کە تایبەتی بێت بە دەوڵەتەوە، خۆ قورئانیش حوکم و دینی تێکەڵ بە یەکتر کردووە و فەرمانیداوە دەوڵەت لەسەر ئەو بناغەیە حوکم بکات کە ئیسلام هێناویەتی.

قورئان لەسەر موسڵمانان واجبی کردووە فەرمان بکەن بە چاکە و نەهی بکەن لە خراپە (وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ) (آل عمران: ١٠٤)، هەرچیەکیش شەریعەت فەرمانی پێکردبێت ئەوە (معروف)ە، هەرچیشی حەرام کردبێت ئەوە مونکەرە. دەی مادام واجب بێت لە بەینی موسڵماناندا کەسانو کۆمەڵانێ هەبن خەڵك بانگ بکەن بۆ راگیر کردنو

بەجێهێنانی ئەوەی کە ئیسلام فەرمانی داوە بەجێبهێنرێت، بۆ قەدەغەکردنی ئەوەی کە ئیسلام حەرامی کردووە دەی هەر ئا بەوە واجب ئەبێت کە دەوڵەت دەوڵەتێکی ئیسلامیی بێت، چونکە ئەگەر وەها نەبێت دەقەکانی قورئان پەکیان ئەکەوێت و بێکار ئەبێت، دیارە هەر بەمەش قورئان کاروباری ئایین تێکەڵ بە کاروباری دنیا ئەکات.

هەروەها قورئان لە دەقە جۆربەجۆرەکاندا و جاری واش هەیە لە یەك دەقدا دین و دنیا تێکەڵ (مزج) ئەکات. توێژەر (الباحث) ئەبینێت یەك دەق کاروباری ئایین و ئەخلاق و کاروباری دنیا کۆئەکاتەوە و تێکەڵیان بە یەکتر ئەکات. بۆ نموونە، خوا ئەفەرموێ: (قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلاَدَكُم مِّنْ إمْلاَقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلاَ تَقْرَبُواْ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) (الأنعام: ١٥١ ).

ئا ئەمە یەك دەقە، شیرك و سەرپێچیکردن لە دایك و باوك و مەردم کوشتن، چ بە ئاشکراو، چ نهێنی داوێن پیسی حەرام و یاساغ ئەکات. بەڕاستی تێکەڵکردنی ین و دنیا لەمە چاکتر و جوانتر نەبووە و نابێت.

قورئان واجبی کردووە لەسەر دەوڵەت کە کاروباری دین و دنیا لەسەر بناغەی قورئان دابمەزرێنێ و رابپەرێنێ، ئەها ئەفەرموێ: (الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ) (الحج: ٤١).

ئەم دەقە بڕیویەتیەوە کە دەوڵەتی نموونەیی (مثالی) ئەوەیە دەستی هاووڵاتیی ئەگرێ بەرەو بەجێهێنانی نوێژ و دانی زەکات، هەر ئەو دەوڵەتەش هەڵئەستێ بە بەجێهێنانی ئەوەی کە خوا ئەمری کردووە بەجێبهێنرێ، هەروەك هەڵئەستێ بە

قەدەغەکردنی ئەوەی کە خوا فەرمانی کردووە بەقەدەغە کردنی. دەی ئەوەی ئەم دەقە واجبی ئەکات ئەوەیە کەوا دەوڵەتەکە دەوڵەتێکی ئیسلامیی بێت و کاروباری حوکم و رامیاری لەسەر بنەڕەتی ئیسلام دابمەزرێ و ببرێت بەڕێوە.

بەڵێ دەق لە قورئاندا ئەوەندە زۆرە کەوا لێرەدا ناتوانین بیانخەینە بەرچاو کە بە تایبەتی هاتوون بۆ چارەسەرکردنی ئاژاوەی ناوخۆیی، ناکۆکیی نێوان دەوڵەتان، ئاشتی و جەنگ، پەیمان بەستن، مامەڵەو هەڵسوکەوت، باری کەسێتیی.

دیسان قورئان بەشێك لە سامانی دەوڵەمەندانی دیاریکردووە کە ئەبێ (یجب) بدرێت بە هەژاران، لە (بیت المال)یشدا مافی دیاریکردووە بۆ هەتیوان و هەژاران‌و رێبواران. قورئان هیچ لایەنێکی دنیایی فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو حوکمی بۆ هێناوە، لە هەمانکاتدا هیچ لایەنێك لە لایەنەکانی عیبادات و بیروباوەڕی بەبێ حوکم نەهێشتۆتەوە، ئیشوکاری دنیای لەسەر بنەڕەتی دین و ئەخلاق دامەزراندووە، هەروەها بۆ رێکوپێککردنی ئیشوکاری دەوڵەت و ئارلستەکردنی حوکمڕانان و میللەت ، دەست بۆ دین و ئەخلاق ئەبات و بە باشترین هۆ دەیانژمێرێ. بە راستی دین و دەوڵەت هەرگیز لەمە زیاتر تێکەڵ ناکرێن، تەنانەت لە ئیسلامدا وای لێدێ دەوڵەت دینە و دینیش دەوڵەتە.

ئەو گەنجە موسڵمانە باوەڕدارانە بە قورئان نازانن، کە قورئان فەرموودەو کردارەکانی پێغەمبەری ﷺ کردووە بەیاسا بۆ موسڵمانان بە شێوەی پێویست (الزام)، لەسەر موسڵمانان واجبی کردووە کە هەر ئەمرێکیان پێبکات ئەبێ ملکەچی و پەیڕەویی بکەن، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە خۆیەوە و بە هەوەس قسە

ناکاتو هەرچی بلێت خوا ئەیخاتە دلێیەوە (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى) (النجم: ٣ـ٤).

لە لایەکی ترەوە، دەقی قورئان دەربارەی بەگوێکردن و پەیڕەوییکردنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ گەلێ زۆرە، لەوانە: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ) (النساء: ٥٩) وە (مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللّهَ) (النساء: ٨٠)، دیسان (قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ) (آل عمران: ٣١) و (وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا) (الحشر: ٧) و (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً) (النساء: ٦٥) هەروەها ئەفەرموێ: (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً) (الأحزاب: ٢١).

**دووەم: ئەو داوایەی کە ئەڵێت شەریعەت بۆ ئەم چەرخەی ئێستا ناشێت:**

هەندێك لەو رۆشنبیرانە لایان وایە شەریعەت بۆ ئەم چەرخەی ئێستا ناشێت، بەڵام هۆی ئەم داوایە دیاریی ناکەن، خۆ ئەگەر بیانگوتایە: فلان بنەما، یان فیسار کۆمەڵە بنەما، بۆ ئەم چەرخە ناشێت و هۆی نەشیانەکەشیان رۆشن بکردایەتەوە، دیارە داواکەیان ئەوسا نرخێکی ئەبوو، لە رووی مەنتیقەوە ئەکرا لە گوتەکەیان بکۆڵینەوە و ئاخاوتنیان لەگەڵا بکەینو بەوەش لارییەکەیان بۆ راست بکەینەوە، بەڵام کاتێ کە ئەڵێن شەریعەت هەمووی بۆ ئەم چەرخە ناشێت، هیچ بەڵگەیەکیش بۆ سەلماندنی داواکەیان پێشکەش ناکەن، دیارە ئەمە بە لای خاوەنی هەموو عەقڵێکی بیردۆستەوە شتێکی غەریبە. لەبەر ئەوەش ئێمە کە ئەو داوایەیان ئەبیستین و ئەشزانین کە نەزانترین و بێئاگاترین

کەسن له شەریعەت، ناهەقمان نییه ئەگەر بلێین: ئا ئەم داوایەیان لەسەر نەزانیی و بوختان وەستاوە. چاکیی شەریعەتەکان لەسەر بناغەی چاکیی بنەماکانی بڕیار ئەدرێت، له شەریعەتی ئیسلامدا یەك بنەما نییه که بتوانریٚ مۆری ناچاکیی پیابنرێت. خۆ ئەگەر بتوانین کۆمەلێك له بنەماکانی ئیسلام بخەینه بەرچاو، ئەوسا بۆمان دەرئەکەویٚ هەندێك موسلمان داوای پووچەلٚ و نەزانی تا چ رادەیەك سەری لێشێواندوون و چەند دووری خستوونەتەوە.

شەریعەتی ئیسلام بڕیاری بنەما (مبدأ)ی یەکسانی داوه له نێوان خەلکدا بەبیٚ قەیدو مەرج، خوای گەوره ئەفەرمویٚ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ) (الحجرات: ١٣)، پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرمویٚ: "الناس سواسية كأسنان المشط الواحد، لا فضل لعربي على عجمي الا بالتقوى". شەریعەتی ئیسلام ئەم بنەمایه یەکسانییەی زیاتر له پێش سیانزه سەده هێناوه، له کاتێکدا یاسا دەستکردەکان که نەفامان شانازییان پێوه ئەکەن تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم پەییان بەم بنەمایه نەبردووه، تا ئێستاش زۆربەی دەولەته ئەوروپاییەکان و ئەمریکاش ئەم بنەمایه به شێوەیەکی مەرجدار جێبەجیٚ ئەکەن.

شەریعەت هەر له یەکەمین رۆژی هاتنەخوارەوەیدا بڕیاری بنەمای سەربەستیی (الحريه)ی له جوانترین شێوەیدا داوه، بڕیاری سەربەستیی بیر، باوەڕ، قسەکردن (حرية الفكر والاعتقاد والقول)ی داوه. دەق لەو بارەیەوه ئێجگار زۆره، وا ئێمەش چەند دانەیەك یاد ئەکەین بۆ نموونه: (قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ) (يونس: ١٠١)، وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ) (آل عمران: ٧)، (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ) (البقرة: ٢٥٦)، (وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ

بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ) (آل عمران: ١٠٤). بنەمای سەربەستیی بە هەر سێ لقەکانیەوە تا دوای شۆرشی فەرەنسا یاسا دەستکردەکان نەیان ناسیبوو، کەچی نەفامەکان ئەم کارچاکیی (فضائل)انە لە شەریعەت ئەسێنن و ئەیانکەن بە یەخەی یاسا دەستکردەکاندا!

یەکێکی تر لەو بنەمایانەی شەریعەتی ئیسلامیی لەسەر وەستاوە، بنەمای دادگەریی بەرفراوانە، خوای مەزن ئەفەرموێ: (وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ) (النساء: ٥٨) و (وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ) (المائدة: ٨) (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاء لِلّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ إِن يَكُنْ غَنِيّاً أَوْ فَقَيراً فَاللّهُ أَوْلَى بِهِمَا فَلاَ تَتَّبِعُواْ الْهَوَى أَن تَعْدِلُواْ) (النساء: ١٣٥). دەی ئەم بنەمایە کە شەریعەت لە رۆژی هاتنەیەوە هێناویەتی، یاسا دەستکردەکان هەتا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم نەیانزانیوە و نەیانناسیوە.

ئا ئەوانە ئەو سێ بنەمایەن کە یاسا تازەکان لەسەر بناغەی ئەوان ئەوەستن، شەریعەت بەر لە یانزە سەدە ئەوانەی زانیوە، ئیتر ئەبێ بۆچی یاساکان بۆ ئەم چەرخە بشێن و شەریعەت نەشێ، کە لە سەر هەمان بنەما وەستاوە؟!

شەریعەتی ئیسلام لە سەرەتای هاتنیەوە، بنەمای راوێژکاریی هێناوە، خوا ئەفەرموێ: (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) (آل عمران: ١٥٩). (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ) (الشورى: ٣٨). لەمەدا شەریعەتی ئیسلام یانزە سەدە پێش یاسا دەستکردەکان کەوتووەو دە سەدەش پێش یاسای ئینگلیزیی کەوتووە. یاسا دەستکردەکان کاتێ بریاری بنەمای راوێژیان داوە، هیچ شتێکی تازەیان نەهێناوەتە کایەوە بەڵکو لە کۆتاییاندا گەڕانەوە بەرەو سەرەتای دەستپێکردنی

شەریعەت، هەروەها شەریعەتی ئیسلام لە یەکەم رۆژی هاتنیەوە، دەسەڵاتی حاكمی سنووردار كردووە، بەو ئیعتیبارەی نوێنەری نەتەوەیە و بەرامبەر هەڵەكانی بەرپرسیار ئەبن. شەریعەت بەسەر حاكم و غەیری حاكمدا لە یەك ئاستدا جێبەجێ ئەكرێت، حاكم لە هەڵسوكەوتیدا ئەبێ لەو سنوورەدا بمێنێتەوەو دەرنەچێت كە شەریعەت بۆی كێشاوە، هیچ پلەیەكی زیاتری نییە بەسەر خەڵكی ترا، ئەمەش هەمووی جێبەجێكردنی تیۆری یەكسانییە.

بەڵێ، شەریعەت ئا ئەو هەموو بنەمایەی هێناوە كە حكومەتانی ئێستا لەسەر ئەوان ئەوەستن، لەوەشدا یانزا سەدە پێش یاسا دەستكردەكان كەوتووە، دەی ئیتر كەی راستە بگوترێ: شەریعەت بۆ ئەم چەرخە ناشێت؟! !

شەریعەتی ئیسلام لەكاتی هاتنیدا مەی حەرام كرد، تەڵاقی رێگە پێدا (مباح) كرد، ئەها خوا ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ) (المائدة: ٩٠) و "(الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) (البقرة: ٢٢٩)، كەچی یاسا دەستكردەكان حەرامكردنی مەیی و رێدان بە تەڵاق لەم سەدەیەدا پەییان پێبردن، ئەویش بە نیوەچڵیی، چونكە هەندێ یاسا بە تەواوەتی مەی یاساغ ئەكات، كەچی هەندێكی تر بەشێوەی لاوەكیی (جزئی) یاساغی ئەكات؟ هەندێ یاسا بەبێ مەرج و قەید رێ بە تەڵاق ئەدات، كەچی هەندێكی تر ئەیبەستێ بە چەندەها قەیدەوە، دەی یاساكان ئەوەیان لە شەریعەت وەرگرتووە، بۆچی بۆ ئەم چەرخە ئەشێن و بۆچی شەریعەت بۆ ئەم چەرخە ناشێ؟ شتێكی سەیرە ! !

شەریعەتی ئیسلام یەكەمین شەریعەتە كە تیۆر (نظرية)ی هاوكاریی كۆمەڵایەتیی، تیۆری هاوگوزەرانیی (التضامن)ی كۆمەڵایەتی لەگەڵ خۆیدا

هێناوە. خوای مەزن ئەفەرموێ: (وَتَعَاوَنُواْ عَلَى الْبرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُواْ عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ) (المائدة: ٢) و (وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ * لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ) (المعارج: ٢٤ـ ٢٥) و (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا) (التوبة: ١٠٣). (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) (التوبة:٦٠). دیسان ئەفەرموێ: (مَّا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ) (الحشر: ٧).

شەریعەت ئەو دوو تیۆرەی بەر لە سیانزە سەدە زانیوە، بەڵام گێتیی نا موسڵمان تا ئەم سەدەیە نەیئەزانی، ئێستاش تا رادەیەك جێبەجێیان دەكات.

شەریعەت دابڕكردن (احتكار) و قۆستنەوە (إستغلال) كردنی دەستەڵات و بەرتیلی حەرام كردووە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "لا یحتكر الا خاطیء". خوا ئەفەرموێ: (وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقاً مِّنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ) (البقرة: ١٨٨)، ئەم بنەمایانەش لەم دواییەدا لە لایەن یاسا دەستكردەكانەوە زانران و ناسران.

شەریعەت لەسەر حەرامكردنی داوێن پیسی بە ئاشكرا و بە پەنهانییەوە، لەسەر حەرامكردنی گوناه و ستەمكردن وەستاوە، گوێبگرە خوا ئەفەرموێ: (قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ) (الأعراف:٣٣).

هەروەها شەریعەت لەسەر بانگكردن بەرەو خێر، فەرمان بە چاكە كردن، نەهی كردن لە خراپە دامەزراوە. خوا ئەفەرموێ: (وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ) (آل عمران: ١٠٤) دەی ئەم بنەمایەی كە

شەریعەتی لەسەر دامەزراوە، هەر ئەمانەن ئەو نموونە بالآیەی کەوا مرۆڤایەتی پەلو باڵیان بۆ ئەکوتیٚ و خەویان پێوە ئەبینیٚ. ئیتر چۆن و بۆچ شەریعەت بۆ ئەم چەرخە ناشێت لە کاتێکدا چەرخ شەیدای نموونە بەرزەکانیەتی؟! !

خۆ ئەگەر بێتو شوێن بنەما ئینسانیەکان و کۆمەڵایەتیی و یاسایەکانی ئەم چەرخە بکەوین، ئەو بنەمایانە کەوا رۆڵەکانی ئەم چەرخە شانازییان پێوە ئەکەن، ئەبینین یەك یەك هەمووومان لە شەریعەتی ئیسلامدا بە جوانترین شێوە هەن، ئەگەر لەبەر درێژبوونەوەی بابەتەکە نەبوایە کۆمەڵێکی تر لەو بنەما و دەقانەمان ئەهێنا بۆ ناو باسەکە.

ئا بەم جۆرە رۆشن ئەبێتەوە داوای (نەشیاویی شەریعەت) لاف و گەزافێکە لەسەر بنەڕەتی بێئاگایی لە شەریعەت بینا کراوەو لە "واقیعی محسوس"دا هیچ پاڵپشتێکی نییە، لەوانەیە ئەگەر تاقە عوزرێك هەبێت پەڕۆی حەیای وێژەرانی ئەو داوایەی پێبکرێت، تەنها ئەمە بێت کە بڵێین: ئەوانەی فێری ئەمە بوون کە یاسا دەستکردەکانی کۆنی ئەوسا، لە سەر بنەمای کۆن دامەزرا بوون و مەنتیقی ئەم چەرخە تازەیە رەتیان ئەکاتەوە، جا ئەوانە ئەم قسەیان وەها لەبەر کردووە کە یاسایەکی گشتیی بێتو بەسەر ئیسلامیشدا جێبەجێ بکریٚ، گوایا سیفەتی کۆنیی، ئیسلامیش ئەگرێتەوە، ئیتر بەبیٚ ئەوەی بیر لەو هەموو جیاوازییە بکەنەوە کە لە نێوان ئیسلامو یاساکانی ترا هەیە.

**سێیەم: ئەو داوایەی کە ئەڵێت هەندێک ئەحکامی شەریعەت کاتییە:**

هەندێك لە رۆشنبیران بە رۆشنبیریی ئەوروپا، رایانوایە کە شەریعەت بۆ ئەم چەرخە ئەشێت، بەڵام هەندیٚ لە حوکمەکانی کە هاتوون بە کاتیی (مؤقت) هاتوون، لەوەشدا مەبەستیان هەندێك ئەحکامی "جنائی"یە، بەتایبەتی ئەو

سزادانانە (العقوبات)ی کە لە یاسا دەستکردەکاندا هاوچەشنیان نییە وەك: بەردەباران‌و دەستبڕین. کاتێك داوایان لێئەکەیت بەڵگە بهێننەوە بۆ سەلماندنی داواکەیان، ئەبینی بەڵگەیان دەست ناکەوێ، بەڵکو شوێن گومان (ظن) کەوتوون، ئەمەش جێگەی حەق ناگرێتەوە.

تەنها ئەوەندە هەیە بەرامبەر ئەو سزادانانە هاوچەشن لە ناو یاسا دەستکردەکاندا نادۆزنەوە، ئیتر ئەیانەوێ بەو داوایانە خۆی لە مەبەستو مەسەلەکە دەرباز و قوتار بکەن. خۆ ئەگەر سبەینێ یاساکان پەنا ببەنە بەر ئەو یاسا "جنائی"یانە ئەوان لە گومانکارییەکەی خۆیان دەستهەڵئەگرن و ئەڵێن ئەو حوکمانە هەمیشەیین!!

خۆ ئەگەر ئەو موسڵمانانە لە ئیسلام وەکو خۆی تێبگەیشتنایە، ئەو جۆرە قسانەیان نەئەکرد، چونکە حوکمەکانی ئیسلام هەمیشەیین و کاتیی نین، چونکە هەر حوکمێك لە ماوەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ هەڵنەوەشابێتەوەو (نسخ) نەبووبێتەوە، هەتا رۆژی زیندووبوونەوە کار ئەکات و هەڵوەشانەوەی بۆ نییە، قورئانیش بەراستەورووبی کەمێك لە پێش مەرگی پێغەمبەرا ﷺ دەریبڕیووە کە بینای قەڵای باوەڕ تەواو بووە، ئیتر ناشێت بۆی زیاد بکرێت، یان لێی هەڵوەشێنرێ. خوا ئەفەرموێ: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً) (المائدة: ٣).

ئەی نابێت ئەو موسڵمانانە ئەمە بزانن، ئەگەر بگونجێت بگوترێت هەندێ لە ئەحکامەکانی شەریعەت کاتیین، ئەوسا ئەگونجێ بەوانی تریش بگوترێت کاتیی، ئەگەر رێ بدرێت بە خەڵك کە هەرکەس بەهەوەسی خۆی حوکم دەربکات ئیتر ئیسلام نامێنێ و لە بەین ئەچێت؟

چوارەم: ئەو داوایەی كه ئەڵێت هەندێ له ئەحكامی ئیسلام جێبەجێ كردنیان له تواناداا نییە:

خاوەنانی ئەم داوایه ئەچن بەگژ (ینا قضون) ئەوانەی پێشوودا، چونكه ئەمانه لەم كاتەدا رایان وایه هەموو حوكمەكانی شەریعەت هەمیشەیین و واجبه جێبەجێ بكرێن، بەڵام رایان وایه هەندێك سزادان بەپێی شەریعەت ـ وەك بەردەباران‌و دەستبڕین ـ ئەمرۆ لەتواناداا نییە، چونكه دەوڵەته موسڵمانەكان لاوازن‌و ژمارەیەك خەڵكی بێگانه لەم وڵاتانەدا ئەژین كه رازی نابن بەوەی ئەم سزادانەیان بەسەردا جێبەجێ بكرێت، یاخۆ دەوڵەتەكانیان قایل نابن بەوەی ئەم سزادانەیان به سەردا جێبەجێ بكرێت. بەكورتی خاوەنەكانی ئەم رایه له ترسی دەوڵەته بێگانەكان نایانەوێ شەریعەت جێبەجێ بكرێ.

دەی ئەم رایەش لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێت، خوای بەدەستەڵات ئەفەرموێ: (فَلاَ تَخْشَوُاْ النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَناً قَلِيلاً وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: ٤٤).

بەو جۆره كەسانه كه هەڵگری ئەو رایەن ئەڵێین: بەشی زۆری فەقیهەكان لەسەر ئەو رایەن كه بێگانه (الاجنبی) بەردەباران ناكرێ‌و دەستی نابڕێ له حاڵەتی زینا كردن، یان دزی كردندا، دەی هیچ شتێك له ئارادا نییه كه نەهێڵێ پەیڕەویی ئەم رایه بكەین.

هەروەها بەم بۆنەیەوە حەز ئەكەین ئاگادارتان بكەینەوە كەوا سزای بەردەباران خەریكه سزایەكی رەمزیی بێت، چونكه هەر زۆر زەحمەته زیناكردن به شایەتی شاهیدان بسەلمێنرێت، هەموو ئەو كەسانەی كه ئەم سزایەیان چەشتووە له رۆژگاری پێغەمبەر و خەلیفه راشدینەكاندا، لەوانه بوون كه خۆیان ددانیان به

کردنی تاوانەکەدا ناوە، نەك لەوانەی کە بە شایەتیدان سەلمابێت. زیناکردنی تەواویش ئەبێ بە یەکێك لەو دوو رێگایە ئیسپات بکرێ، لە شەیەتیدانیشدا ئەوە بە مەرج گیراوە ئەبێ چوار پیاوی دادگەر شایەتیی بدەن، کەوا حاڵەتی (خەنجەر لە کێلانیان دیوە)، ئەمەش هەر زۆر بە دەگمەن و زۆر کەم روو ئەدات، هەروەها لەم رۆژگارەشدا ئەو جۆرە کەسانەی ئیمان پاڵیان پێوە بنێت لەسەر دانانان بە کردنی ئەو کارەدا، سوور بوون لەسەر ئیعترافەکە، زۆر کەمن.

پێنجەم: ئەو داوایەی کە ئەڵێت فیقهی ئیسلامیی بریتییە لە رای فەقیهەکان:

هەندێك لە رۆشنبیران بە رۆشنبیریی ئەوروپا، بڕوایان وایە کە فیقهی ئیسلامیی بە زۆری داهێنانی فەقیهەکانە، جا ئەگەر کەسێك تیۆرێکی فیقهیی ئیسلامییان نیشان بدات لەوانەی کە تا ئەم دواییە زانایانی یاسای دەستکرد نەیانزانیوە، ئەبینی هەر زۆر زۆر سەریان سوڕ ئەمێنێ، چۆن فوقەهای ئیسلام لە سەدەی حەوتەم و هەشتەمی زاینیدا گەیشتوونەتە ئەوەی کە زانایانی یاسا لە سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا ئەوسا پێی گەیشتوون؟!، جارێك هەندێك لەو رۆشنبیرانە پێیانگوتم، ئێمە لامان وایە کە پێشەوایانی مەزهەبە فیقهیەکان لە سەرووی ئاستی مرۆڤەوە بوون، بۆیە توانیویانە سیانزە سەدە پێش مرۆڤایەتی بکەون لە بیرکردنەوەدا.

بێگومان ئەو کەسەی وابزانێت فیقهی ئیسلامیی داهێنانی فەقیهەکانی ئیسلامە، ئەوە لە هەڵەدا ئەژی، هەر کەسیش لای وابێت فەقیهەکان لە بیرکردنەوەیاندا پێش مرۆڤایەتی کەوتوون هەڵەیە، راستیەکەی ئەمەیە، گەرچی پیاوانی فیقهی ئیسلامیی خاوەنی ئاسۆیەکی فراوان بوون، بیرکردنەوەیان هەر زۆر نایاب بووە، بەڵام لە گیرفانی خۆیاندا هیچیان دەرنەهێناوە، لە سەرووی ئاستی

بەشەریشەوە نەبوون، بەڵکو راستیی و واقیعەکە ئەمەیە، ئەوان لەبەردەمی خۆیاندا شەریعەتێکی دەوڵەمەندی پڕ لە تیۆرو بنەمایان بەرچاو کەوت، ئەمجا دەستیانکرد بە شەرحکردنی ئەو بنەمایانەو ئەو تیۆرانەیان بەرچاو خست، ئەمان کاریان لە کاری فەقیه و موجتەهیدان تێنەپەڕی، دیارە کاری هەموو فەقیه و موجتەهیدێك بریتیە لە کۆکردنەوەی هەر شتێك کە دێتە ژێر رکێفی هەر تیۆرێکەوە، کۆکردنەوەی هەر شتێك کە هەر بنەمایەك بە سەریدا جێبەجێ ئەبێت، جا ئەگەر لێرەدا داهێنانێك، یان پێشکەوتنێك لە بیرکردنەوەدا بەرچاو بکەوێت، بێگومان ئەوە داهێنانی ئەو شەریعەتەیە کەوا پێش بیرکردنەوەی بەشەر کەوتووە و بڵندترین تیۆری هێناوە بۆ ئاڕاستەکردنی بەشەر بەرەو بەرزی و کەماڵ و بەرز کردنەوەی بەرەو شکۆیی ئاستی شەریعەتە.

فەقیهان تیۆری یەکسانی بێسنوور (مطلق)یان دانەهێناوە.. تیۆری سەربەستیی بەربڵاویان دانەهێناوە، تیۆری دادگەریی شامیل ئەوان دایان نەهێناوە، بەڵکو فەقیهان ئەوانەیان لە دەقی قورئانو سوننەتەوە هەڵگۆزاوە، ئەم دەقانەشمان خستە بەرچاو و پێویست ناکا دووبارەیان بکەینەوە.

هەروەها تیۆری راوێژکاری، تیۆری سنووردار کردنی دەسەڵاتی حاکم و ناوبردنی بە نوێنەری نەتەوە، تیۆری بەرپرسیارێتی حاکم لە هەڵە و دوژمنکارییەکانی، تیۆری حەرامکردنی مەی، تیۆری تەڵاق، ئەمانە هیچ کامێکیان فەقیهەکان دروستیان نەکردوون و دایان نەهێناون، بەڵکو فەقیهان ئەو تیۆرانەیان لە دەقی قورئان و سوننەتەوە وەرگرتووە و ئەمەشمان لەمەوبەر بەرچاو خست.

ئەوانەی لە (التزاماتی مدنی)دا نووسینیان بە مەرج گرتووە، لە کەلوپەلی بازرگانییدا ئیجازەی سەلماندنیان بە گەواهیدانی شاهیدان روونکردۆتەوە،

فەقیهەکان نین، بەڵکو دەقی قورئانە: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُب بَّيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئاً فَإن كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهاً أَوْ ضَعِيفاً أَوْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى وَلاَ يَأْبَ الشُّهَدَاء إِذَا مَا دُعُواْ وَلاَ تَسْأَمُوْاْ أَن تَكْتُبُوْهُ صَغِيراً أَو كَبِيراً إِلَى أَجَلِهِ ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ اللّهِ وَأَقْومُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلاَّ تَكْتُبُوهَا) (البقرة: ٢٨٢).

تیۆری پوچەڵ کردنەوەی پەیمانداری ناچاریی (عقود الاذعان)، تیۆری "حق الملتزم" لە سەپاندنی مەرجەکانی عەقد (العقد)دا فەقیهەکان دایان نەهێناون، بەڵکو قورئان هێناونی. خوای مەزن ئەفەرمێ: (وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللّهَ رَبَّهُ وَلاَ يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئاً فَإن كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهاً أَوْ ضَعِيفاً أَوْ لاَ يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ). (البقرة: ٢٨٢).

ئەوە پێی ئەوترێ "نظرية الطوارىء"، ئێمەش لە عورفی یاسای ئەمڕۆماندا پێی ئەڵێین تیۆری گۆڕانی بارودۆخ "نظرية تغير الظروف"، فەقیهەکان دایان نەهێناوە، بەڵکو ئەو تیۆرەیان لەم دەقە قورئانیانە وەرگرتووە، ئەفەرموێ: (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا) (البقرة: ٢٨٦) هەروەها ئەفەرموێ: (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ) (الحج: ٧٨) و (وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلاَّ مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ) (الأنعام: ١١٩).

تیۆری چاوپۆشیکردنیان لە زۆرلێکراو و ناچار دانەناوە، بەڵکو شەریعەتەکە هێناویەتی، ئەفەرموێ: (إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ) (النحل: ١٠٦). ئەفەرموێ: (فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ) (البقرة: ١٧٣). هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "رفع عن أمتى الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه."

تیۆری لێبوردن لە بچووکو شێت و خەوتوو، سزانەدانیان، فەقیهەکان دایان نەهێناوە، بەڵکو فورموودەی پێغەمبەرە ﷺ: "رفع القلم عن ثلاث: عن الصبى حتى يحتلم، وعن النائم حتى يصحوا، وعن المجنون حتى يفيق."

تیۆری چەسپاندن (تثبيت)ی سزا، فەقیهەکان نەیان هێنا، بەڵکو قورئان هێناویەتی و ئەفەرموێ: (وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى) (فاطر:١٨)، پێغەمبەر ﷺ بڕیاری داوەو ئەفەرموێ: "لا يؤاخذ الرجل بجريرة أبيه ولا بجريرة أخيه". بە "أبو رمثه" و کوڕەکەی فەرمووی: "انه لا يجنى عليك ولا تجنى عليه."

ئەوەی کە حوکمی ئەنقەستی جیاکردووەتەوە لە حوکمی هەڵەکاریی (الخطأ)، فەقیهەکان نەبوون، بەڵکو قورئان بووە، ئەها ئەفەرموێ: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلاَّ خَطَئاً وَمَن قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَئاً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ..) (النساء: ٩٢). ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى) (البقرة: ١٧٨). هەروەها (وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ) (ألأحزاب: ٥).

هەر بەم جۆرە، هەر تیۆرێك، یان هەر بنەمایەکی گشتیی ئەگری، ئەبینی دەقێکی قورئانیی، یان سوننەتی بۆ هاتووە، کاری فەقیهان هەر ئەوە بووە کە هەڵساون بە شەرحکردنی تیۆرەکە، یان بنەماکە، ئەمجا بەیانی مەرجەکانی جێبەجێ کردنی هەر تیۆر و هەر بنەمایەکیان کردووە، لەگەڵ ئاشکرا کردنی

ئەوەی دێتە ژێر رکێفیانەوە، لەوەشدا فەقیهان خۆیان بەستووەتەوە بە دەقەکانی شەریعەتەوە، بە بنەما گشتییەکانی و رۆحی یاسادانانەکەیەوە.
لەگەڵ ئەو هەمووەشدا فەقیهان لە رووی گێڕاندنەوەی لق و پارچەکان (الفروع والجزئیات)ەوە بۆ ئەسڵەکانیان، ئاشکرا کردنی ئەو حوکمانەی جێبەجێ ئەکرێن بەسەریاندا، هەوڵو تێکۆشانێکی زۆریان داوەو کردووە، چونکە وەك لەمەوبەر گوتمان: "شەریعەت دەقی لە شێوەی درێژەپێدانا نەهێناوە کە لە هەموو حاڵێتێکدا لق و بەشە وردەکان حوکم بکەن".
ئا ئەمە حوکمی واقیع و حەقیقەتە و بەرامبەر ئەو داوایە ئەوەستێ کە ئەڵێت فیقهی ئیسلامیی داهێنانی فەقیهەکانە، لەوانەیە خاوەنانی ئەم داوایە ئەوە خستبنیە ناو ئەم هەڵەیە کە فیقهی شەریعەت بە تەرازووی فیقهی یاسا بکێشن، چونکە حوکمەکانی یاسا زانایانی یاسا دایان ئەهێنن و لە دواییدا ئەیانکەن بە حوکمی پەیڕەویی کراو و ئەبن بە یاسا و لەسەری ئەڕۆن.
حۆزگە ئەو بەرێزانە شتێکیان لە (مذهب الظاهریین) ئەخوێندەوە، چونکە ئەو فەقیهانە جگە لە قورئان و سوننە و ئیجماع (الاجماع)، هیچ شتێکی تر بە سەرچاوەی یاسادانان ناژمێرن، ددان نانێن بە (قیاس)و سەرچاوەکانی ترا، تەنانەت بە (مەزهەبی سەحابە)شدا. هەرچەندە (ظاهرین) فەرموودە (مرسلة)کانیش پەسەند ناکەن، کەچی توانیویانە بۆ هەموو حوکمێك، بۆ هەموو بنەما و تیۆرێك، دەقێکی رێك و راست لە قورئان، یان سوننەی صەحیح بێنن، رام وایە هەر ئەم کارە خۆی بە تەنیا بەسە بۆ قایلکردن و قایلبوونی ئەو بەڕێزانەی باوەڕیان بەو جۆرە هەڵەی گرتووەتە خۆی سەبارەت بە فیقهی ئیسلامیی.

**٣ ـ کۆمەڵی رۆشنبیران بە رۆشنبیریی ئیسلامی:**

ئەم کۆمەڵە ئەوانە ئەگرێتەوە کە لە پلەیەکی بەرزی رۆشنبیریی ئیسلامییدان، هەروەها خوارووی ئەمانەش ئەگرێتەوە، ژمارەی ئەم کۆمەڵە کەم نییە، گەرچی لە چاو ئەوانەدا کە رۆشنبیرن بە رۆشنبیریی ئەوروپا، کەمن. ئەم کۆمەڵە دەستەڵات (نفوذ)ێکی مەزنیان هەیە بەسەر گەلە موسڵمانەکاندا لە هەر شتێکدا کە ئەم گەلانە بزانن ئەو شتە پەیوەندیی بە ئیسلامەوە هەیە.

بەڵام ئەم کۆمەڵە لە دەستەڵاتی حوکمرانیدا هیچ بەشێکیان بۆ نەهێشتۆتەوە، پیاوانی ئەم کۆمەڵە ئەوپەڕەکەی کاری ئامۆژگارییکردن (الوعظ) و پێش نوێژیی و دەرس وتنەوەیان لە دەستدا ماوە، جاری واش ئەبێ داوەرییان بدرێتێ، بەڵام جگە لە هەندێك گیروگرفتی ئەحواڵی شەخسیی، ئیتر بۆیان نییە داوەریی تێدا بکەن.

بەر لەوەی یاسا ئەوروپییەکان بهێنرێنە ناو وڵاتە ئیسلامییەکان، ئەم کۆمەڵە هەموو دەستەڵاتێکی هەبوو، بەڵام لە دوای هاتنی یاساکان، بارودۆخی تازە خزاندنیە بازنەیەکی تەسکەوە، ئیتر وردە وردە دەستەڵاتیان رووی کردە تیاچوون و بە تەواوەتی تیاچوو، ئەم حاڵەتەش ئەوەندە درێژەی کێشا هەتا خۆیشیان لەگەڵیا راهاتنو زۆربەشیان بێدەنگ لێی راوەستان، نەك بەهۆی پەسەندکردن و گوێڕایەڵی کردنی حاڵەتەکە، بەڵکو بە هۆی بێدەستەڵاتییو ئارام بەخۆگرتنەوە، ئەم کۆمەڵە خۆی بە لێپرسراوی ئیسلام ئەزانێت و خەڵکیش هەر بەو چاوەوە سەیری ئەکات، چونکە لە هەموو کەس زیاتر لە ئەحکامی ئیسلام ئەزانێ، پیاوانی ئەم کۆمەڵە لە هەمووان زیاتر دیفاع لە ئیسلام ئەکەن، گەرچی کەسانێکی زۆریش هەن رایان وایە کە رووداوان و کارەساتان زیاتر لە جارێك

سەلماندوویانە کە ئەم کۆمەڵە دەستەوسان و بێتوانا بووە لە دیفاعکردن لە ئیسلام، لە ئەنجامی بێدەستەڵاتیی ئەوانەوە بوو، یاسا ئەوروپییەکان هاتن و لە وڵاتانی ئیسلامدا ریشەیان داکوتاو شەریعەتی ئیسلام لە کار خرا، تا جیلێك رۆیشت و جیلێك ـ نەوەیەك ـ هات کەوا لە شەریعەتی ئیسلام هیچ نازانێت، جگە لەوەی پەیوەندیی هەیە بە عیباداتو ئەحوالی شەخسییەوە، تەنانەت نەفامان وا ئەزانن ئەوەی ئەمڕۆ لە وڵاتدا جێبەجێ ئەکرێ ئەحکامی ئیسلامە، یان ئیسلام لاریی نییە لە جێبەجێکردنیدا، هەڵگرانی رۆشنبیریی ئەوروپاش وا ئەزانن ئیسلام دینە، نەك دەوڵەت، یان شتێکی وای تێدا نییە کە بۆ حوکمکردن لە ناو خەڵکدا بشێت و باش بێت، تا وای لێهات کە هەر تەنها زانایانی ئیسلام شەریعەت بناسن.

لەو رووەوە کە دەستەڵات و توانای دیفاعکردنیان لە ئیسلام نەبووبێت، جارێك یان زیاتر، زانایانی ئیسلام لەو رووەوە عەیبیان لێناگیرێت، لە رووی هاتنە کایەی بەرهەمی سروشتی و مەنتیقی ئەو بێدەستەڵاتیەوە عەیبدار نابن، بەڵکو لەو رووەوە عەیبدار ئەبن کە ئەوەی ئەیانتوانی بیکەنو بیبەخشن لە توانا و کاتیان بۆ دیفاعکردن لە ئیسلام، نەیانکربێ و نەیانبەخشیبێ.

بێگومان هەموو هەوڵو کاتی خۆیانیان لەم رێگەیەدا بەکارهێنا، بەڵام بارودۆخ گونجاو و لەبار نەبوو، بێگومان هێشتا هەر هەموو تێکۆشان و کاتێکیان بە بەردەوامیی لەم پێناوەدا خەرج ئەکەن، بەو هیوایەی زاڵبوون و سەرکەوتن بەدەست بێنن.

ئەمرۆ لە وڵاتانی ئیسلامییدا بەرەیەکی رۆشنبیر بە رۆشنبیریی ئیسلامیی لە پلەیەکی بەرزا هەیە، زۆر بە تەنگی گێرانەوەی ئەوەوەیە کە ئیسلام لە دەستی

چووە، سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران لە هەقناسیدا کاری تێناکات، هیچ عەیبێکیان تێدا بەدی ناکرێت، ئەوە نەبێ کە زۆر موعجبن بە موسڵمانانی ئەوەڵ (السلف) لە هەندێ رووگە (اتجاهات)دا، بەهۆی ئەوەشەوە زۆربەی زۆری توانایان لە عیباداتو ئامۆژگاریکردنا خەرج ئەکەن، خۆ ئەگەر زۆربەی توانای خۆیانیان خەرج بکردایە لەوەدا شەریعەتی لە کارکەوتوومان بیری موسڵمانان بخەنەوە، ئەو یاسا دەستکردانەی کە پێچەوانەی شەریعەتن بیری موسڵمانانیان بخەنەوە، ئەوەیان بیر بخەنەوە کە حوکمی ئیسلام چۆنە بەرامبەر بەو لەکارخستنە و بەو یاساهێنانە، دیارە زۆر بە کەڵك ئەبێ، چ بۆ خۆیانو چ بۆ ئیسلام، بەوەش خۆیانیان ئەدایە ژێر قورسایی باری جیهاد و رێگەی دوور و درێژی هەڵدانیان ئەگرتە بەر. ئەو دەوڵەتانەی کە حوکمی موسڵمانان ئەکەن دیموکراتیین، جا زۆربەی کەسانی گەل ئەگەر فیکرەیەك وەربگرن، زۆری پێناچێت ئەو فیکرەیە شیاوی جێبەجێکردن (تنفیذ) ئەبێت.

ئەم بەرە نوێیە لە بانگەوازەکەیدا بەرەو ئیسلام و بەرەو داگیرکردنی شەریعەت و شەعائیر کۆمەڵە رێگەیەك ئەگرێتەبەر، لەوانەیە بۆ قەناعەت پێکردن و فێرکردنی عەوامەکان باش و بە سوود بێت، بەڵام لە قەناعەتکردن بەوانەی لەسەر شێوەی ئەوروپا رۆشنبیرن، کەڵکی نییە لە کاتێکا ئەمانەی داوی دەسەڵاتیان پەخشە بەسەر ژیانی گشتیداو حوکم و سوڵتان لە وڵاتانی ئیسلامدا بەدەست ئەوانەوەیە، ئەبوایە زانایانی ئیسلام بە زۆریی هەوڵ و تێکۆشانی خۆیانیان لە قەناعەتکردن بەوانە، فێرکردنیان خەرج بکردایە، چونکە ئەمانە ئەگەر ئیسلام بە چاکیی و لەسەر حەقیقەتی خۆی بناسن، بێگومان ئەبن بە باشترین کارگێر و بە دڵسۆزترین بانگکەر بۆ ئیسلام.

داوا ئەکەم لە زانایانی ئیسلام لە هەموو بارودۆخێکدا، لە هەموو رۆژێکدا، رۆشنی بکەنەوە بۆ هەلگرانی رۆشنبیریی ئەوروپا کە یاسا ئەوروپیەکان چەندێ دژو پێچەوانەی ئیسلامن، حوکمی ئیسلام چەندێ پەستە بەرامبەر بەوانەی ئەو یاسا دەستکردانە بەجێئەهێنن. لەوەش زیاتر، هەلگرانی رۆشنبیریی ئەوروپا ـ کە ئێمە باسیان ئەکەین ـ کێن؟ ئەوانە موسڵمانانێکن کەوا نەزانو نەشارەزان بە حەقائیقی ئیسلام، بەلام زۆر چاك ئامادەن بۆ فێربوونی ئەوەی نایزانن لە ئیسلام.

ئومێدەوار و داواکارم لە زانایانی ئیسلام کە یارمەتیی ئەو رۆشنبیرانە بدەن تا بتوانن دیراسەی شەریعەت بکەن، تا بتوانن شارەزای بنەماو تیۆرەکانی ببن و بزانن چەندێ سەرکەوتوون بەسەر یاسا دەستکردەکاندا، زانایانیش ئەتوانن بگەنە ئەم مەبەستە چ بە پێکهێنانی لیژنە (لجان) لە پیاوانی مەزهەبەکان، ئەوساش هەر لیژنەیەك دەست ئەکات بە کۆکردنەوەی کتێبە گرنگەکانی هەر مەزهەبێك، لە هەمووان یەك کتێب بە زمانی ئەم چەرخە دائەنێن، چ بە دانانی کتێبان لە زمان و رژێمی چەرخیدا، ئەم کتێبانە ماددەکانی شەریعەتی ئیسلامیی بە شێوەیەکی دلڕفێن پێش چاو بخەن لەگەلْ بەراوردکردنی مەزهەبە ئیسلامییەکان لەگەلْ یەکتردا، لەوەدا کتێبێك باسی کڕین و فرۆشتن بکات، یەکێکی تر باسی بە کرێگرتن (الاجار) بکات، یەکێکی تر باسی شەریکات، چوارەم باسی تاپی بوون (الافلاس)،.... هتد.

ئومێدەوار و داواکارم لە زانایانی ئیسلام، رۆشنی بکەنەوە بۆ حاکمان دەستەکان (الهیئات)ی یاسادانان کە ئیسلام چەند پەست و تەرەیە لەو یاسایانەی پێچەوانەی بن، چەند تووڕەیە لەو کەسانەی دایان ئەنێن و لەوانەش جێبەجێیان

ئەكەن، دەی خۆ ئەوانەش هەموویان موسڵمانن و پێیان گرانه به قەد موویەك له ئیسلام لابدەن، بەڵام حوكمەكانی ئیسلام ناناسن و ناشارەزایانن.
داوا ئەكەم له زانایانی ئیسلام كه تێبكۆشن تاهیچ یاسایەك بەبێ زانینی ئەوان، بەبێ چاودێریی ئەوان دەرنەچێت، بۆ ئەوەی یاسایەك دەرنەچێت كه پێچەوانەی ئیسلام بێت.
ئەی زانابانی ئیسلام! تەنیا عەیبێك كه بەدی ئەكرێت له هەموو وڵاته ئیسلامەكاندا ئەمەیە: حاكمان و دەسەڵاتدارانیان ئەحكامی ئیسلام شارەزا نین، جەماوەری ئیسلام ئەحكامی ئیسلام نازانن، تەنیا رێگایەكیش كه هەبێت بۆ چاككردنی ئەم حاڵەته، ئەوە فێری موسڵمانەتی بكرێن و له ئیسلام شارەزا بكرێن، هەر كۆمەڵێك بەو رێگایەی لەسەریەتی‌و لەگەڵیا راهاتووە، دیارە هیچ موسڵمانێكیش سەرپێچیی ناكات لەوەی فێری ئەوە ببێت له ئاینەكەیدا كه لەمەوبەر نەیزانیبێت.
دواجار من كه ئەڵێم هەڵگرانی رۆشنبیریی ئەوروپا ناشارەزای ئیسلامن، مەبەستم نرخ شكاندنیان نییە، بەڵكو ددان به واقعدا ئەنێم، بگرە منیش خۆم یەكێك بووم لەوانە.

## كێ بەرپرسیارە لەوەی ئێمەی تێداین؟

موسڵمانان هەموویان بەرپرسیارن لەوەی ئێمەی تێداین‌و لەوەی كه ئیسلامی تێدایە، بێگومان له رووی بەرپرسیارییانەوە جیاوازییان هەیە، بەرپرسیاریی كۆمەڵێك سووكە، كەچی بەرپرسیاریی كۆمەڵێكی تر زۆر قورسە، بەڵام هەموویان بەرپرسیارن لەو نەزانیی و فیسقو كوفرە.. لەو دووبەرەكیی و لاوازیی و زەلیلیە كەوا تیا ئەژین، هەموویان بەرپرسیارن لەو هەژاریی و

ئیستغلالەی تێیدان، لەو کۆلّ و بارەی ئەیبەن بۆ ئیستیعمار و لەو بەڵایەی بەدەست داگیرکەرەوە یەخەیان ئەگرێت.

## بەرپرسیاریی جەماوەر:

جەماوەری موسڵمان بەرپرسیارە لەو وەزعەی ئەمڕۆ ئیسلام پێی گەیشتووە، ئەگەر بە هۆی بێئاگایی جەماوەرەوە لە ئیسلام نەبوایە، ئیسلام نە ئەگەیشتە ئەم ئاستەی کە ئێستا تیایەتی، جەماوەر وردە وردە لە ئیسلام لایدا، هەتاکو گەیشتە رادەی خۆداماڵین لە دینەکە، بەبێئەوەی بزانێت کە خۆی لە ئیسلام داماڵیوە.

جەماوەری موسڵمان لەگەڵ (فسقو کفرو الحاد)دا وەها راهات هەرکام لەوانەی بە وەزعێ سەیر ئەکرد گوایا دژ و پێچەوانەی ئیسلام نییە، یاخۆ لای وابوو کە ئیسلام کارو پەیوەندیی نییە بە بەرهەڵستیکردنی فسق و کوفر و ئیلحادەوە، بەڵکو دوور تا نزیك لاقەی ئەم جۆرە شتانە ناکات!

ئیسلام واجبی کردووە لەسەر موسڵمانان کە فێری ئیسلام ببن و لێی تێبگەن و یەکتر فێر بکەن (وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً فَلَوْلاَ نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُواْ إِلَيْهِمْ) (التوبة: ١٢٢). بەڵێ گەلێ کۆمەڵ لە موسڵمانان چوون بە دوای زانستداو قەومەکانی قەومەکانی خۆیانیان ئاگادار کردەوەو هەوڵیاندا تێیان بگەیەنن لە دین، بەڵام حکومەتە ئیسلامییەکان هەروەك مەرجیان کردبێت دەستیان کرد بە بەرهەڵستیکردنی ئەو کۆمەڵانە و نەیانهێشت ئەوەی ئیسلام فەرمانی کردووە بە کردنی، بەجێی

بهێنن، ئەمەش له پێناوی رازیکردنی ئیستعمار و بەگوێکردنی ملهوڕان، لەبەر خاتری دۆستایەتی چاوی کاڵیی دوژمنانی ئیسلام.

جەماوەریش بە وەزعی ئەو حکومەتانە رازی بوو کە هەق وابوو رازی نەبێت، بەوەش جەماوەر بەشداریی ئەو حکومەتانەی کرد له خنکاندنی ئیسلامدا، له وێرانکردنی ئەو کۆمەڵانەدا که کاریان ئەکرد بۆ ئیسلام.

بێگومان جەماوەری موسڵمانان هێز و عیزەت و کەرامەتی خۆی لەدەستدا، ئەوەتا بەندەی بەهێزەکانە، بەندەی ئیستعمارە، بەندەی حاکمانە، ئەوانە خۆراکەکەی ئەفرێنن، هێزەکانی دادەچۆرێنن، کەرامەتی ئەخەنە ژێر پێ، سەربەستیی لێزەوت ئەکەن، بە کورتیی ئەوەی بەسەر موسڵماناندا هاتووە بە هۆی ئەوەوەیە وازیان له دینەکەیان هێناوە که دینی هێز و عیززەت و کەرامەتە، جا هار که بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو دینە، ئەوسا ئەو هێزەی بزریان کردووە، ئەو عیززەتەی لێی بێبەش بوون، ئەو کەرامەتەی هەناسەی کاڵی بۆ هەڵئەکێشن، ئەگەڕێتەوە بۆیان و ئەکەوێتەوە دەستیان.

جەماوەری موسڵمانان له بێئاگاییەکی کوشندەدا دەژین، بێئاگایە له ئاینەکەی، بێئاگایە له دنیای، بێئاگایە له خودی خۆی! جا رۆژێك که چاو ئەکاتەوە و راستیی ئەبینێ، ئەوسا بۆی دەرئەکەوێت که دنیا و ئاخرەتی له دەست دەرچووە، بە هۆی ئەوەوە کە له خوا دوورکەوتووەتەوە و له کتێبەکەی خوا لای هەڵکردووە.

## بەرپرسیاریی حکومەتە ئیسلامییەکان:

حکومەتە ئیسلامییەکان تا رادەیەکی زۆر بەرپرسیارن بەرامبەر بەو ریسوایی و بێنرخیەی هێنراوە بەسەر ئیسلامدا و بەرامبەر بەو زەلیلی و دەردەسەرییەی یەخەی موسڵمانانی گرتووە.

حکومەتە ئیسلامییەکان ئیسلامیان لە کاروباری ژیان دوورخستەوە، ئەوەیان خستە بەردەم موسڵمانان کەوا خوای مەزن لێی حەرام کردوون، بە حوکمی غەیری خوا حوکمیان کردن، حکومەتە ئیسلامیەکان پاڵ ئەنێن بە موسڵمانانەوە بەرەو گومڕاییەکانی ئەوروپا و روویان وەرئەگێرن لە هیدایەتی پەروەردگار، لە نێوان موسڵماناندا بەپێی یاسا دەستکردەکان حوکم ئەکەن، نەك بەپێی حوکمی شەریعەت.

حکومەتە ئیسلامییەکان لە حوکم کردن و رامیاریی و ئیدارەدا لە ئیسلام چوونە دەرەوە و سەربەستیی و یەکسانیی و دادگەریی هەڵگیرا، ئەوەی ئیسلام واجبی کردبوو ئەوان فرێیاندا، ئیتر هاوکاریی و بەزەیە هاتنەوە بە یەکتراو باوەش کردن بە یەکتردا نەما، ئەوەی ئیسلام حەرامی کردبوو لە ستەم و لە حەق لادان، لە ئیستغلال و دابڕین، ئەم حکومەتانە خەڵکیان هان ئەدا بۆی، کۆمەڵگەی ئیسلامییان لەسەر بنەڕەتی فەساد و فەسادکردن و فاسقیی و یاخیبوون و خۆپەرستی و سەرکەشیی بینا کرد.

حکومەتە ئیسلامییەکان ناهێڵن موسڵمانان فێری دینەکەیان ببن و پەروەردگارەکەیان بناسن و ئەرکەکانی سەرشانیان جێبەجێ بکەن.

حکومەتە ئیسلامییەکان دۆستایەتیی لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا ئەبەستن لە کاتێکا کە خوا ئەمەی لێ حەرام کردوون! موسڵمانانیش بەشێکیان وان لە بە

گوێکردنی دوژمنانی خوادا، بە هۆی ئەو حکومەتانەوە، کە پێویستیش وایە بە گوێیان نەکەن.

بەڵێ، حکوومەتە ئیسلامییەکان لاوازی و زەلیلییان کرد بە میرات بۆ موسڵمانان، ئیستغلال و هەژارییان بە سەردا هێنان، ستەم و فەسادیان بە ناودا بڵاوکردنەوە.

## بەرپرسیاریی سەرۆك دەوڵەتەکان

سەرۆکانی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە هەموو کەس زیاتر بەرپرسیارن لەوەی کەوا تووشی ئیسلام بووە، خۆ ئەگەر یاسا دەستکردەکان لەو بەرپرسیاریە چاوپۆشییان لێبکەن، بەوە ئیسلام لێیان نابورێت و لە ورد و درشتی کارەکان لێیان ئەپرسێتەوە، هەروەها یاساکان ناتوانن نەهێڵن کە ئینسان ئەوانە لەگەڵ واقعدا رووبەڕوو بکاتەوە و چاویان دابدڕێ تا حەقیقەتەکان ببینن.

ئەی گروهی سەرۆکەکان! حوکم و دەستەڵات لە دەستاندایە، هێز و توانای وەهاتان هەیە و تیایە کە بتوانن ئیسلام بگەیەننەوە ئەو شوێنەی کە پێی گەیشتبوو، بەڵێ، ئێوە لە پێشینانتانەوە چەندان وەزعی پێچەوانەی ئیسلامتان بە میرات بۆ هاتووەتەوە، ئەوەتا ئێستا تیایا ئەژین، ئێوەش دەستەڵاتی خۆتان لەسەر ئەو وەزعانە راگیر ئەکەن، چ بزانن، یان نەزانن بەوەی کەوا پێچەوانەی ئیسلامن، دەی ئەم وەزعە میراتیانە یەکەمین شتێکن کە ئیسلام بێهێز ئەکەن و موسڵمانان لە راپەڕین دوا ئەخەن، بەوەش هەموو بێهێزییەکی ئیسلام لە گەردنی ئێوەدا ئەبێت، دیارە هەموو بەهێزبوونێکیشی لە ئێوە ئەناسرێت. کەواتە بۆ ئێوە چاکتر وەهایە کەسان (أفراد)ێك بن لە کەسانی دەوڵەتێکی

بەهێز، نەك پاشاو ئەمیرو سەرۆك بن لە دەوڵەتێکی لاوازی کۆیلەدا کە کاربەدەستێکی بچووك لە کاربەدەستانی ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە بیبات بەڕێوەو خاوەنی ئەمرو نەهی بێت بەسەریەوە، حکومەت پێکبێنێ‌و هەڵیوەشێنێتەوە، فەرمانی عەرشەکانتان بخاتە لەرزە، قاچی ئەمیران‌و سەرۆکان بارزێنێ.

ئێوە ـ ئەی گروهی سەرۆکەکان ـ پەرتەوازەن! دەی بۆ خۆتان‌و بۆ ئیسلامیش واچاکە هێزەکانتان کۆببنەوە، ئێوە پشتان کردۆتە یەك، یاخۆ لە یەکتر دوور و کەوتوونەتەوە، دەی بۆ خۆتان‌و بۆ ئیسلامیش واچاکە هاریکاریی لەگەڵ یەکتردا بکەن‌و یەکبگرن. خۆ ئەگەر هەندێکتان گەردن کەچ بن بۆ هەندێکی ترتان، زۆر باشترە لەوەی هەمووتان گەردنکەچ بن بۆ ئیستعمارو ببێتە ئاغای هەمووتان.

ئەی گروهی سەرۆکەکان! پێش هەموو شتێك ئەبێ بزانن کەوا ئێوە موسڵمانن، دەی ئیسلام بخەنە سەرووی هەموو شتێکەوە، لە خۆتاندا حوکمی پێبکەن، بیکەن بە بناوانی حوکمتان، لەسەر ئیسلام دەوڵەتەکانتان دابمەزرێنن، کەسایەتی خۆتان مەکەن بە کۆسپ و تاشەبەردی سەر ڕێگەی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلام، کەسایەتی ئێوە تیائەچێت و دوای مەرگیش جگە لە ئاگر و بەهەشت شتێکی تر نییە، هیچ کام لە ئێوەش نە موڵك، نەسامان، نە کەس و کار فریای ناکەوێت، بەڵکو کاری چاك و دامەزراویی لەسەر فەرمانی خوا، فریای ئەکەوێت و بە کەڵکی دێت.

بۆ ئێوە واچاکە مێژوو بە جۆرێك یادتان بکات کە هاوکارییتان بووبێ لە دامەزراندنەوەی دەوڵەت و حوکمی ئیسلامیدا، نەك ببنە هۆی دواخستنی دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە بە هۆی ئەوەوە دەست لە مەنسەب بەرنەدەن و

خۆتان جۆش بكەن بەو حوكمو وەزعانەوە كە ئیسلام بۆ موسڵمانان رەوای نابینیّ.

ئەم هەمووەش تەنها پێویستی بە هێزی لێبڕانی ئێوە، زاڵبوونی ئێوە بەسەر دەروونی خۆتاندا هەیە، جا ئەگەر ئێوە زالّ ببن بەسەر دەروونی خۆتاندا ئیتر بە سەر هەموو شتێكا زاڵبوون، خۆ ئەگەر ئێوە لەبەرامبەری قازانجەكانتانەوە، لەبەرامبەری غەرڕابوون بەحوكمو دەستەڵاتەوە لاوازیی بنوێنن، موسڵمانان هەموویان لە پەرتەوازەیی و لاوازیی و زەلیلی و ملكەچییدا هەر ئەمێنێتەوە، بەهێزەكانیش دەست ئەكێشن بەسەر ئێوە و ئەوانیشدا، داگیركەرانیش ئێوە و ئەوانیش ئەترسێنن، دەوڵەتە بەهێزە تەماعكارەكان ئێوە و ئەوان ئەجولێنن، ئەوانەش كە زۆر چاك ئەزانن هێز لە یەكێتیی و لاوازیی لە پەرتەوازەییدایە، ئێوەو ئەوان ئیستغلال ئەكەن.

ئەی سەرۆكەكان! دڵتان خۆش نەبێت بە میرنشینیی و دەسەڵات، نازناو (لقب)و تاج نەتانخەڵەتێنیّ، چونكە ئەو دڵخۆشبوونە بوو موسڵمانانی زەلیل كرد، كیانی ئیسلامیی بێهێز كرد لە ناویاندا، پارچە پارچەی كردن و بوون بە مەمالیك و دەوڵەتی بچووك بچووك و چەندان میرنشین كە نەتوانن مافی خۆیان بپارێزن و نەتوانن دوژمن لەخۆیان دوور بخەنەوە، تەنانەت موسڵمانان بەو هەموو زۆرییەیانەوە، بە پانتایی وڵاتەكانیانەوە، بە زۆریی مەودای خالّ و ژمارەی كارگەی وڵاتەكانیانەوە، لەگەلّ بوونی هۆیەكانی سەركردایەتیی و عیززەتدا، موسڵمانان ئا بەو هەموو شتانەوە ئەمڕۆ بوون بە لاوازترین و زەلیلترین و بێنرخترین كەسانی سەر زەوی لەبەرچاو دەوڵەتاندا.

دەی كە هەر دەست بەرنادەن لە قازانجەكانتان، لە پایە و پلەكانتان، لە نازناو و دەسەڵاتەكانتان، هەوڵبدەن بە هەر شێوەیەك بێت كۆببنەوە، یەكبگرن، هێزی وڵاتەكانتان یەك پێبگرن، تا موسڵمانان هەموویان یەك هێز و یەك دەست بن.

ئەی سەرۆكانی دەوڵەتە ئیسلامییەكان! پلەو نازناوەكانتان لای خوا هیچتان بۆناكەن، خوای مەزن لێتان، لەوانەی پێش ئێوەش ئەپرسێتەوە دەربارەی ئیسلام و موسڵمانان، هەروەها لێتان ئەپرسێتەوە لەسەر ئەوەی كە ئیسلام لە وڵاتەكانتاندا غەیب بووەتەوە، لە حوكم كردنتاندا پشتگوێتان خستووە، لێتان ئەپرسێتەوە لەسەر ئەوەی كە یەكێتیی موسڵمانانتان گۆڕی بۆ پەرتەوازەیی، هێزیانتان گۆری بۆ لاوازی، وەدەوڵەتەكەیانتان پچڕ پچڕ كرد. ئێوە و ئەوانەی پێش ئێوە موسڵمانانتان كرد بە نموونەی پەرتەوازەیی دەستكرد، بەهێزیی لاوازبوون، بە كەرامەتی لەدەستچوو، بەو نەماعەی پیاوانی خاوەن كەرامەت زەلیل دەكات، ناهێڵێت پاڵەوانان دەركەون و سەری مەردان كز ئەكات.

ئەی سەرۆكانی دەوڵەتە ئیسلامییەكان! ئەوەندە بە تەنگ گەورەیی و دەسەڵاتەوە مەبن، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "انكم ستحرصون علی الامارة وستكون ندامة یوم القیمة، فنعم المرضعة، وبئست الفاطمة".

ئەبێ بزانن گەورەیی (الامارە)، سپاردە (أمانە)یە، هەركەس بە حەق وەریبگرێت و ئەركی سەرشانی خۆی تیایدا بەجێبێنێ، لە رۆژی قیامەتدا سەرفراز ئەبێت، دەی سپاردەكان بدەنەوە بە خاوەنەكانیان، چونكە خوا لەسەریان لێتان ئەپرسێتەوە، یادی فەرموودەكەی پێغەمبەر بكەنەوە كە بە (أبو ذر)ی فەرموو كاتێ كە داوای كرد بیكات بە گەورە، "یا أباذر انك ضعیف، وانها أمانة، وانها یوم القیامة خزی وندامة، الا من أخذها بحقها وأدی الذی علیە فیها".

## بەرپرسیاری زانایانی ئیسلام

زانایانی ئیسلام تاوانی ئەوەی ئێمەی تێداین، گوناهی ئەوەی تووشی ئیسلام بووە، وا بە کۆڵیانەوە، تاوانی ئیستعمار و داگیرکەران، تاوانی حاکمان و حکومەتان، تاوانی جەماوەری بێئاگا لە ئیسلام..دەرچوو لە ئیسلام لە گەردنی زانایانی ئیسلامدایە، وا بە کۆڵی ئەوانەوە.

زانایانی ئیسلام هەقی خۆیانە ئەو هەمووەیان بدرێت بە کۆڵدا، چونکە یان رووی خۆشیان بەرامبەر ئیستعمار نیشان ئەدا، یاخۆ لێی بێدەنگ ئەبوون.. جاروبار لایەنی حکوماتی ئیسلامیان ئەگرت و جاروبار بێدەنگ و ئەبوون لێیان، هەروەها چونکە لە کاتێکدا جەماوەری موسڵمانان گرنگترین ئەحکامی ئیسلامیی نە ئەزانی، بێئاگا بوو لەوەی ئیسلام داوای ئەکات، زانایانی ئیسلام بێ خەم پاڵیان لێدابووەوە.

ئا بەمە زانایانی ئیسلام موسڵمانانیان لە ئیسلام دوورخستەوە، چونکە حوکمی ئیسلامیان سەبارەت بە ئیستعمار و داگیرکەران رۆشن نەکردەوە بۆ جەماوەری موسڵمان، حوکمی ئیسلامیان رۆشن نەکردەوە بۆ جەماوەری موسڵمانان بەرامبەر بەو حکومەتانەی روو خۆشیی ئەنوێنن لەگەڵ ئیستعماردا و دۆستایەتی لەگەڵدا ئەبەستن، بەوەش جەماوەر بەرامبەر ئیستعمار بێدەنگیی هەڵبژارد و گوێرایەڵ بوو بۆ ئەو حکومەتانەی خزمەتی ئیستعمار ئەکەن، بەڵێ، ئیسلام بە هۆی بێدەنگیی زانا بەرێزەکانەوە گوم بوو، جەماوەریش رازیبوو بە گوم بوونی ئیسلام، بەڵکو یارمەتی ئەوەشیدا، چونکە لای وابوو زانایانی ئیسلام هەرگیز بێدەنگ نابن، سا مەگەر لەشتێکدا لەگەڵ ئیسلامدا گونجاو بێت و خوای گەورە لەو شتە رازیی بێت، زانایانی ئیسلام چاوی خۆیانیان قوچاند و دەمی خۆیانیان

داخست، گوێی خۆیانیان بە پەنجە ئاخنی و سەبارەت بە ئیسلام خەوتن، جا لەبەر ئەوەی چەند سەدەیەك لە خەو هەڵنەسان، موسڵمانانیش بە شوێن ئەواندا خەوتن، وەهاشیان ئەزانی کە ئیسلام لەوپەڕی سەلامەتیی بێمەترسیدایە، ئەگینا زانا بلیمەتەکانی قەت لێی نەئەخەوتن!

زانایانی ئیسلام هەر زوو لە ئیسلام خەوتن، چونکە هێرشیان نەکردە سەر وەزعێك لەو وەزعانەی کە بە پێچەوانەی ئیسلامەوەن، قەت هەوڵیان نەدا فەرمانیٚ، یان حوکمێك کەوا پێچەوانەی حوکمەکانی ئیسلام بێت بووەستێت، تەنیا جارێکیش کۆنەبوونەوە داوای گەڕانەوە بکەن بەرەو ئیسلام!

بێگومان حکومڕانان ستەمکاریی زۆریان کرد، حەرامی زۆریان حەڵاڵ کرد، خوێنی زۆریان رشت، ئابڕووی زۆریان برد، لە زەوییدا فەسادکارییان کرد، لە سنوورەکانی خوا چوونە دەرەوە..زانایان بەرامبەر بەو ستەمکارییانە نەجووڵان، حەلاڵکردنی حەرام تووڕەی نەکردن، هەروەك ئیسلام داوای هیچی لێنەکردبن! هیچی لەسەر فەرز نەکردبن! لەسەری واجب نەکردبن فەرمان بکەن بە چاکە و نەهی بکەن لە خراپە! داوای لێنەکردبن ئامۆژگاریی حکومڕانان بکەن و داوای گەڕانەوە بکەن بەرەو حوکمی ئیسلام!!

وڵاتە ئیسلامییەکان داگیرکران، کەچی ئەو داگیرکردنە زاناکانی نیگەران نەکرد، حوکمی قورئانو سوننەشیان رۆشن نەکردەوە بۆ خەڵك لە ڕووی جیهاد و بەرهەڵستیکردنی داگیرکردنەوە، یان سەبارەت بە ئاشتیخوازیی لەگەڵ داگیرکەردا، یان دۆستایەتیی نواندن لەگەڵ داگیرکەردا!

ئەوەش لە کاتێکدا لەسەر زانایانی ئیسلام واجب بوو کەوا دەنگ دابڕن و دووربکەونەوە لەو داگیرکەرە کافرانە، بەڵام...! بەداخەوە...!! بوون بە

دۆستی دوژمنانی ئیسلام، مالّی عەمیدی دەولّەتە داگیرکەرەکەیان کرد بە بنکەیەك بۆ زیندووکردنەوەی هەندێ بۆنە (مناسبە)ی ئیسلامیی!! یاسا دەستکردەکان لەناو وڵاتە ئیسلامیەکاندا بەجێهێنران، دیارە پێچەوانەی حوکمەکانی ئیسلامیش بوون، جێبەجێکردنیان بوو بەهۆی لە کارکەوتنی ئیسلام، حەڵاڵکردنی ئەوەی خوا حەرامی کردبوو، حەرامکردنی ئەوەی خوا حەڵاڵی کردبوو، کەچی زانایان بە تێکشکانی ئیسلام نیگەران نەبوون، بۆ ئاییندەی خۆیشیان قەڵسبوون، لە کاتێکدا لەسەر حیسابی ئیسلام ئەخۆن و ئەپۆشنو ئەژین! کۆبوونەوەیەکیان نەکرد کەوا راوێژی ئاییندەی خۆیانو ئیسلامی تێدا باس بکەن!

بەرەڵڵاییو گوناه بڵاوبوونەوە، حانات و سەماگە (مراقص) دروستکران، دەولّەتە موسڵمانەکان ئیزنی ئافرەتانی موسڵمانیاندا فەسادکاریی بکەن، خەڵك بە ئاشکرا رووی کردە ئەوەی کە پێچەوانەی ئیسلامە، کەچی زانایان خۆیان هێنایەوە یەك، سەریان بردەوە بە ناوا، لە سنووری سەر ڕاوەشاندن و پڵتە پڵتی لێودا مانەوە!!

قوتابخانە دنیاییە (المدنیە)کان دامەزرێنرانو ددانیشیان نەئەنا بە خوێندنی دینییدا، زانایانی ئیسلام یەکەمین کەسێك بوون کە روویان تێکردن و منالّەکانی خۆیانیان بۆ ناردن، ئەمجا قوتابخانە تەبشیریەکان دامەزرێنران، ئەو قوتابخانانەی کە مەسیحییەت بڵاودەکەنەوە بەناو موسڵماناندا و ئاژاوە ئەنێنەوە لە ناو بەچکە موسڵماناندا سەبارەت بە دینەکەیان، زانا بەڕێزەکان کچەکانی خۆیانیان بۆ ناردن، تا بەشکو فێری زمانی بێگانە و سووڕدانو فێری ئایینی مەسیحیی ببن!!

جا هەر کاتێکیش هەر حکومەتێك بە دەست هەر کارێکەوە گیری بخواردایە، پەنای ئەبردە بەر زانایانی ئیسلام، ئەمانیش بە پەلە خەلکیان ئەگێڕایەوە بۆ ئیتاعەکردنی ئەو حکومەتانەی ڕێگەی مەی و زینا و سووکاریی و کوفر و فاسقیی ئەدەن و هەوەسی خەلك و تاسەی حاکمان و حزبەکان ئەهێنێ و ئەمجا ئەیانخاتە شوێن حوکمەکانی ئیسلام.

ئەم حالەتە لەگەل ژیانی موسلمانانندا ئەوەندە درێژەی کێشا، جەماوەری موسلمانان وای بۆ ئەچوو ئەو فاسقیی و سەرپێچییەی ئێمەی تێدا ئەژین ئیسلامە ڕاستەقینەکەیە!! خراپەکاریی و تاوانباریی بلاوبووەوە، فەساد تەشەنەی کرد و چاککردن (الاصلاح) قورس و نارەحەت بوو، ئەمەش هەمووی بە هۆی (تهاون) گوێ پێنەدانی زانایانی ئیسلامەوە بوو، کە ڕاگیرکردنی حوکمەکانی ئیسلامیان پشتگوێ خست.

زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، دەی شیاوی زانایان نییە هەلوێستیان بەو جۆرە بێت لە میراتی پێغەمبەراندا، ئیسلامیش ئەرکی ئەمر کردن بە چاکە و نەهیی کردن لە خراپەی لەسەر زانایان فەرز کردووە، جا ئەگەر زانایانی بەڕێز ئەم ئەرکە گرنگە پشتگوێ بخەن، ئەبێ کێی تر پێی هەلسێت؟!

خوای گەورە لەم دواییەدا دەرگای خێری کردەوە بۆ زانایانی میسر، لەم دواییەدا هاتنە دەنگ، ڕاپەڕین و کۆبوونەوە و دەستیان کرد بە وتاردان و داوایان کرد لە خەلك مان بگرێت و لە مالدا بمێننەوە، بەلام ئایا ئا ئەو هەمووە لە پێناوی ئیسلامدا.. لە پێناوی ڕاگیرکردنەوەی حوکمەکانی ئیسلاما کرا؟ نە بە خوا، بەلکو ئەو هەلچوونەیان، ئەو هەلچوون کردنە بە خەلك لە پێناوی ڕوتبە و عەلاوات و دەرەجاتی مالیی‌و کەراماتی شەخسییدا بوو. لە پێناوی ئەوانەدا

بەیاناتیان دەرکرد، کۆبوونەوەیان سازکرد، وتار هۆنینەوە و بە ئایاتی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر وتارەکانیان رازاندەوە.

بەڵێ، ئەو هەمووەیان لە پێناوی خۆیاندا، بۆ پاراستنی خۆیان کرد، لە پێناوی ئیسلامدا نەیانکرد، هەروەك ئیسلام لای ئەوانە لە خوارووی خودی خۆیانەوە تەماشای بکەن و کەرامەتی ئیسلام لە خوارووی کەرامەتی ئەوانەوە بێت! جێی داخە! هەندێك لەوانە لەو کۆبوونەوانەدا ویستیان یادی ئیسلام بکرێت، ئەم توورەییە لە پێناوی ئیسلامدا ئاراستە بکرێت، کەچی بێدەنگیان کردن و بیرەکەیانیان بەلاوە باش نەبوو، هەروەك کارکردن بۆ ئیسلام لەبەر چاوی زانایانی ئیسلامدا کارێکی نەگونجاو و خراپ بێت!

ئەی زانایانی ئیسلام! سەبارەت بە خۆتان و ئیسلام لە خوا بترسن.

ئەی زانایانی ئیسلام! ئێوە لەو کاتەوە کە نرخ و گرنگیی ئیسلام لە دڵتاندا هاتە خوارەوە، نرخ و گرنگییتان لای دەوڵەتان و لای حوکمڕانان گوم بوو و نەما.

ئەی زانایانی ئیسلام! سەربەرزیی ئێوە بەستراوە بە بەرزیی ئیسلامەوە، هێزی ئێوە لە هێزی ئیسلامەوەیە، جا ئەگەر ئەتانەوێ سەربەرزیی و هێز بکەوێتە گیانتان هەوڵبدەن بۆ سەربەرزیی و بەهێزبوونی ئیسلام.

ئەی زانایانی ئیسلام! ئەو حاڵەتەی کە بریتیبێ لە زمانگرتن لە بەیانکردنی حوکمی خوادا، لە چاوجوقاندن لەئاستی دوژمنانی خوادا لە کاتێکدا هەتکی حوکمی خوا ئەکەن، ئەو حاڵەتە بە هیچ جۆرێك ناوی موسڵمانەتی لێنانرێت.

ئەی زانایانی ئیسلام! ئەوە موسڵمانەتی نییە ئێوە لە (معاهد) پەیمانگاکاندا قوتابیان فێری ئەحکامی ئیسلام بکەن، لە کاتێکدا حکومەتەکانتان کار بەو حوکمانە ناکەن.

ئەی زانایانی ئیسلام! موسڵمانەتی ئەوە نییە لەسەر میمبەرەکان بووەستن خەڵکی فێری رەوشتی جوان و جێبەجێکردنی عیبادات بکەن، بەڵام لە رووی حوکم و حوکمڕانان و یاسادانان و قەزاوەتەوە، لە رووی کۆمەڵایەتیی و ئابوریی و هەڵسوکەوتەوە لەگەڵ دۆستان و دوژمناندا بە نەزانیی ئەو خەڵکە بهێڵنەوە.

بۆچی شت رۆشن ناکەنەوە بۆ خەڵك، خۆ کاری ئێوە رۆشنکردنەوەیە؟ بۆچی حوکمی ئیسلام بەرامبەر داگیرکردن رۆشنناکەنەوە؟، بۆچی بۆیان بەیان ناکەن تا بزانن دۆست و یاریان کێیە و ئەبێ بە گژ کێدا بچن و بەرهەڵستی کێ بکەن؟

بۆچی بەیانی حوکمی ئیسلام ناکەن بۆ خەڵك، ئایا ئیسلام واجبی دەکات لەسەر خەڵك، ئیتاعەی ئەوانە بکات کە بە پێچەوانەی حوکمی ئیسلامەوە ئەجولێنەوە و بەئەمری هەوەسی نەفس کار ئەکەن، ئایا ئیتاعە کردنی ئەوانە واجبە؟ یاخۆ راپەریین لەدژیان واجبە؟

بۆچی بەیانی حوکمی ئیسلام ناکەن بۆ خەڵك لەرووی یاسا دەستکردەکانەوە؟ ئایا لەسەر موسڵمانان واجبە بە گوێیان بکەن، یان واجبە سەرپێچییان لێ بکەن؟

بۆچی بەیانی حوکمی ئیسلام ناکەن بۆ خەڵك لە سامان و ئیستغلال و ئیحتکاردا؟ بۆچی باسی جێبەجێکردنی ئەو حوکمە بەسەر گوزەرانی دارایی و ژیانی ئابوورییماندا ناکەن؟

بۆچی باسی حوکمی ئیسلام ناکەن بۆ خەڵك بەرامبەر بەو دەوڵەمەندە کار چەپەڵە و بەو هەژارە لە برسا مردووە، یان بەو دەوڵەمەندییە چەپەڵە و بەو هەژارییە کوشندەییە؟

بۆچی بەیانی حوکمی ئیسلام ناکەن بۆ خەڵك سەبارەت بەوانەی ئەچن بە گژ ئەوانەدا بانگی خەڵك ئەکەن بەرەو موسڵمانەتیی، یاخۆ یاریدەی ئەوانە ئەدەن کە ئەجەنگێن لە دژی ئەوانەی کار ئەکەن لە پێناوی ئیسلامدا؟

بۆچی بەیانی حوکمی ئیسلام ناکەن بۆ خەڵك لە ڕووی ئامۆژگاریی و بەیانکردنەوە، ئایا بە درێژایی تەمەن یەکجار واجبە، یاخۆ دووبارەکردنەوەیان هەر کە پێویست بێت واجبە، تا بیری خەڵك بکەوێتەوە کە پەیڕەوییکردنی ئیسلام لە هەموو کات و شوێنێکا لە هەموو حاڵەتێکدا واجبە؟

بۆچی بەیانی حوکمی ئیسلام ناکەن لە کەسێکدا وێڵە، عەوداڵە بە شوێن ڕێزی کەسایەتیی خۆیدا، کەچی دوور ئەکەوێتەوە لە باسی قەدر و ڕێزی ئیسلام؟

ئەی زانایان! من ئینکاریی لەوەدا ناکەم کە لە ناو ئێوەدا کۆمەڵێکی کەمی خاوەن کەرامەت هەیە و بەپێی قورئان جووڵاونەتەوە، لەسەر فەرمانی خوا بەردەوام بووە لە ژیانیدا، هەروەها ئەزانم لە ئێوەدا هەیە زۆر لە زانستو هێز و ژیانی خۆی بەخشیوە لە ڕێگەی دامەزراندنی حوکمی قورئاندا، لەوەشدا ڕەخنەی ڕەخنەگران و سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران ساردی نەکردووەتەوە، بەڵام سوێند بە خوا ئەمانەتان زۆر کەمن و حەزیش ناکەن لە ئێوەمانان بدرێنە قەڵەم و بە ناوی ئێوەوە ناوببرێن، ئەوەش بزانین جوانیی کاری ئەم کۆمەڵە کەمە خێرکارە، ناشیرینی کارەکانی ئێوە ناسڕێتەوە و باری گوناهتان سووك ناکات و سڕوساردیی و بێ موبالاتیتان پەڕۆ ناکات.

ئەی زاناكان! دەی ئێوەش وەك ئەو كۆمەڵە خێركارە بن، لەسەر ڕێوشوێنی ئەوان بڕۆن، كار بكەن بۆ ئیسلام، چونكە دەمێكی دوور و درێژە بێدەنگن لە ئیسلام، گەر وەها بن و وەهاش بكەن، سوێند بەخوا بۆ خۆتان و بۆ ئیسلامیش چاك ئەبێت.

کتێبەکانی پڕۆژەی تیشك

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەکەم) | جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان (کتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان<br>رامانو سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی رەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئـان وەحـی ئاسمانـە، نـەك رەنگدانـەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان له سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتـۆر موحـسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان له پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکـەمین دەسـتووری نووسـراو لـە جیهانـدا، بەڵـگەنامەیەکی گـرنگی سـەردەمـی پێغەمبـەر (صلی الله علیه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیـسلامناسیی یـان ئیـسلامنەناسیی، وەڵامێـك بـۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بـۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسـینی: د. عەبدولحەمیـد ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانـی: ئامینـە صـدیق عەبدولعەزیز |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا كۆمەڵە دیدارێكە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناكبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاكەلی |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەكانی بوخاری و موسلیم | ئامادەكردن و وەرگێڕانی: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەكخستنی میرنشینە كوردییەكاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد كاكە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەكان، ڕەواندنەوەی كۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەكانی ئیسلام | ن: دكتۆر كەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب ڕەشید |
| ٣٨ | عوسمانی كوڕی عەففان، كەسایەتی و سەردەمەكەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەكە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |

| | | |
|---|---|---|
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەكردنی: رەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماكانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەكەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی راگەیاندن و راگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەكانی قورئان | ن: ئیكرام كەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەكان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەكانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
| ٤٦ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی كۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەكی بۆ نووسیوەو رێكیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | كـۆچ<br>كۆمەڵە چیرۆكێكی واقیعیی كۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: كاوە محەمەد شارباژێڕی |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ – ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفی محمد الطحان<br>وەرگێڕانی:محمد عبدول رحیم |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٠ | مێژووی کوردەکانی جەزیرە ٤٤٧–٦٥٦ ك | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێڕانی: عبدالرحیم معرفتی |
| ٥١ | ئایا خوا کچی هەیە ؟<br>وەڵامێك بۆ کتێبی (کچانی خوا) | نووسینی: ڕوقیـە صـدیق عبدالعزیز |
| ٥٢ | گەشتی قیامەت | نووسینی: ناصـح ئیـبراهیم سازانی |
| ٥٣ | بیری ئوسووڵیی ئیسلامی (لەنێوان خوێندنەوەو نەخوێندەواریدا | فاضل قەرەداغی |
| ٥٤ | دەروازەیەك لەمەڕ کێشەی ڕۆچوون<br>هۆکار.. کاریگەرێتی .. چارەسەر | ئامـادەکردنی : یاسـین ئەحمـەد زەنگەنە |
| ٥٥ | ئاین لە فیکری مەسعود محەمەد دا | نووسینی: عومەر عەلی غفور |
| ٥٦ | ئیسلام لـە نێـوان نـەزانی عالمـەکانی و بـێ توانـایی نەوەکانی | نووسینی: جەمال حەبیبوڵا |